ناوی پەرتوک: بورکانی شیعر
ناوی هۆنەر: خدر محمد کۆساری
بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر
تایتلی بەرگ: نەوزاد کۆیی
بەرگ : أمین مخلص
نۆرە و ساڵی چاپ: سێیەم ١٤٣٢ك – ٢٠١١ز
تیراژ: ٢٠٠٠ دانە
لەکتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی ( ١٤٣ ) ساڵی ٢٠٠٦ دراوەتێ

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و راگەیاندن
هەولێر- شەقامی دلدگا - ژێر لوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmall.com

# پێشدەستی چاپی دووەم

سەرەڕای ئەوەی چۆن و چەندی لە تواناماندابوو سەبارەت بەچاپی یەکەمی دیوانی کۆساری کردمان ، بەڵام هێشتا ناتوانین نکۆڵی لەوەبکەین هەم درەنگ و هەم ناتەواو ئەنجام درا ، ئەمەش وای کرد بەردەوام لە بیرو بەرنامەی هەنگاوێکی کامڵتر دابین ، بۆ ئەم مەبەستەش وا بە لوتفی خوای پەروەردگار و پاشان هاوکاری دۆستان و دڵسۆزان و خانەوادەی بەرێزی ، چاپی دووەمی دیوانەکە بە شێوازێکی تازە و پێدا چوونەوەیەکی تەواوەوە چاو و دڵتان رۆشن دەکاتەوە.

دەخوازین بەم هەنگاوەش گیانی کۆساری شادتر و پاداشتی زیاتریش بە ئێمە و هەموو ئەو خۆشەویست و بەرێزانە بەگشتی و (مامۆستا علی باپیر و زانا سعید و عبدالله علی و رێبوار کوێستانی و نووسینگەی تەفسیر و خانەوادەی کۆساری و کاك جمال و توانا حمدامین ) بەتایبەتی ببڕێت کە هەرلایەو بە جۆرێك زەحمەتیان لەگەڵ ئەم کارە پێویست و بایەخدارەدا کە - خزمەتێکی گەورەیە بە ئەدەب و کتێبخانەی کوردی — کێشاوە و مشوریان لێ خواردووە ، هیوادارین هەموانمان توانیبێتمان بەشێك لە ئەرك و وەفاداریمان لە ئاست کۆساری شەهید و شاعیردا بەجێ گەیاندبێت .

بێگومان کۆساری کە بە تریفەی پەیڤی جوان و مانا و مەبەستی قوڵ و هێما و ئاماژەی ناوازەو زەینی روون و سەدای زوڵاڵەوە لە ناو ئامێزی هیدایەت و لە سەر دوندی ڕابوونی ئیسلامی کوردستانەوە لەگەڵ بورکانی ڕاپەریندا ، بورکانی شیعریشی لە مزگەوتی گەورەی ڕانیەوە بە ڕووی ستەم و ستەمکاراندا تەقاندەوە ، بۆ هەمیشە بە ئاسمانی سەروەری یەوە دەدرەوشێتەوە و، بەردەوام دەنگە زوڵاڵ و بە جۆش و خرۆشەکەی لەگەڵ نەعرەتەی ڕاپەرین لە گوێدا دەزرینگێتەوە و (خامە ڕوخام و خاوەن فام و قام)ەکەشی لە ناو ئەدەبی رەسەنی کوردی دا بۆ هەمیشە ( وەکو پەری سینەی پەڕاو ، ڕەنگی تاڤگە ،وەك قەڵبەزە و شەپۆلی ئاو ، وەکو تروسکەی چاوی بروسکە ، وەك خەزێنەی سەرهەڵگیراو ، وەك بەفری لوتکەی بەرهەتاو ) خۆی دەنوێنێ .

**شەریف وەرزێر**

**٢٠٠٦/٣/٥ ڕانیە**

# پێشەکی

**بە قەڵەمی : مامۆستا عەلی باپیر**

**الحمد لله و الصلاة و السلام على رسول الله محمد و أله و من اهتدى بهداه**

کاتێك برایان داوایان لێ کردم چاوێك بە شیعرەکانی کاك (خدر کۆساری)دا بگێڕم و پێشەکی یەك بۆ دیوانی شیعرەکانی بنوسم ، ڕاستەوخۆ مەودای بیر و خولیام بەرەو دوا گێڕامیەوە بەرەو سەرەتای هەشتایەکان کە ئەو کاتە من سەرەتای خوێندنی زانکۆم بوو ، ماڵمان- واتە ماڵی بابم- لە شاری ڕانیە بوو ، لەگەڵ ماڵی مام محمدی زێڕنگەر- بابی کاك خدر کۆساری- دراوسێ بووین کورد گوتەنی (ماڵ بە ماڵێ وە) ! ئەو سەروحەدەش کاك خدر کوڕێکی مێرد منداڵە بوو لەگەڵ بابی سەرگەرمی کاری زێڕنگەری بوو، دیارە ئەو کاتە (خدر) کوڕێکی ئاسایی بوو وەك منداڵ و کوڕەکانی دیکەی گەڕەکی (قولە).

بەڵام وەك پێشینان دەڵێن (کاریلە هەر لە بن سەبەتەدا نابێ) و (هەر دەوەنن دەبنە دار) و دوای ئەوەی کاك خدر بە دەنگی زوڵاڵی بانگەوازی ئیسلامی بێدار بۆوە و بە نووری هیدایەتی خوا دڵ ڕووناك و بە ئاوی سازگاری قورئان دەروونی پاك بۆوە، هێدی هێدی هەست و نەستی ئیسلامەتی تێدا بە هێز بوو و ، سەرەنجامیش لە سایەی ئەو هەست و نەستەوە پیت و پێز کەوتە تەقینەوە و هەرچەندە بە وردی نازانم کەی دەستی بە شیعر گوتن و نوسین کردووە ، بەڵام وا دیارە کانیاوی خوڕپە و ئیلهامی شیعریشی هەر لەگەڵ وەرگرتنی هیدایەتی خواوە دەستی بە هەڵقوڵین کردووە ، چونکە بە سەرنج دان لە شیعرەکانی – هەرچەندە بەندە زۆریش شیعر ناس نیە – لە سەرەتای شیعرەکانی یەوە هەست بە کرچ و کاڵی و وشە ڕیز کردن و کەم نیوە ڕۆکی دەکرێ. بەڵام لە سەرجەم شیعرەکانی دا هەست بە دینداری و ئیسلام خوازی و لەگەڵ خوا بوون دەکرێ و پێچەوانەی ئەمە نابینرێ.

دیاره هەڵسەنگاندنی شیعرەکانی کاك خدر کۆساری حەواڵەی برا شاعیر و شیعر ناسەکان دەکەم و حەز ناکەم لە هەموو مەیدانان دا ئەسپی خۆم تاو بدەم ، بەڵام بە پەسەندی دەزانم لەم پێشەکی یەدا ئاماژە بۆ چەند ڕاستی یەك بکەم:

**یەکەم:-**

ئیسلام لە سۆنگەی ئەوە وە کە بەرنامە و پەیڕەوی سەر لەبەری ژیان و گوزەرانە پێویستی بەوە هەیە کە هەم بۆ بڵاو کردنەوە و گەیاندنی و هەم بۆ پاراستنی و بەرگری لێ کردنی لە هەموو سەنگەر و بەرەکانی ڕووبەڕوو بوونەوە و بەرەنگاری‌یەوە کاری بۆ بکرێ و دیفاعی لێ بکرێ ، دیارە ئەدەبیش کە شیعر بەشێکی هەرە گرنگیەتی یەکێکە لەو سەنگەرانە و دەبێ ئیسلامی یەکان زۆر وریای بن و چاکی مەحکەم بکەن ، ئەو کەسانەش کە گومانیان وایە (شیعر) شتێکی خراپ و نا پەسەندە چونکە خودای زانا لە قورئانیدا فەرموویەتی: ﴿و الشعراء يتبعهم الغاوُن....﴾الشعراء (٢٢٤) بە هەڵەدا چوو ون ، چونکە خوای کاربەجێ لە ئایەتێکی دوای ئەو ئایەتەدا فەرموویەتی: ﴿إلا الذين امنوا وعملوا الصالحات و ذكروا الله كثيرا وانتصروا من بعد ما ظلموا وسيعلم الذين ظلموا اى منقلب ينقلبون﴾ الشعراء(٢٢٧) ، پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ فەرموویەتی: (ان من الشعر لحكمة و ان من البيان لسحرا).

بەڵێ ! وەك زانا و پێشەوایانمان فەرموویانە: (الشعر قول حسنه حسن ، وقبيحه قبيح) واتە: شیعر قسەیەکە باشەکەی باش و دزێوەکەشی دزێوە.

دووەم:-

لە سۆنگەی ئەوەوە کە سۆز و عاتیفە پێکهێنەرێکی بنچینەیی و گرنگی شیعرە و زۆربەی شاعیرەکان ئەو لایەنەیان بەسەردا زاڵە و زۆر وریا نەبن لە خشتەیان دەبات بە هۆی زۆر تێنووسان و بە زایەدان (الافراط والتفريط)ەوە ، پێویستە شاعیرانی ئیسلام زۆر هەوڵی خۆ شارەزاکردن و بەرچاو ڕوون بوونەوەیان بدەن دەربارەی قورئان و سوننەت و بۆ هەر مەسەلەیەك کە تەواو لێ ی شارەزا و دڵنیا نەبن پرس و ڕاوێژ بە زانا و شارەزایانی ئیسلام بکەن بەر لەوەی مەبەستەکەیان لە قاڵبی شیعر دابڕێژن ، چونکە

گەلێك جار بە هۆی دەربڕین و تەعبیری جوان و سەرنج ڕاکێشەوە هەق بە ناهەق و ناهەقیش بە هەق دێتە بەرچاو (وان من البیان لسحرا)!.

سێ یەم:-

دەبێ ئەدیب و شاعیر و هونەرمەندەکانمان ڕاوێژ بە یەکتر کردن و پرس و ڕا و ڕەخنە و تێ بینی و پێشنیازی یەکتر وەرگرتن بکەنە پیشە ، کە بێگومان ڕاوێژ (الشوری) بنچینەی ڕاپەڕاندنی کارو باری ئیسلامی یە لە هەموو بوارێکدا وە بە ڕاوێژ و قسە لە یەکتر وەرگرتن و ڕەخنە و تێبینی و پێشنیاز خستنە ڕوو بەرهەمی ئەدیب و شاعیر و هونەرمەندەکانمان گەشە دەکات و بە هێز و پێزتر دەبێ و لە کرچ و کاڵی و ناتەواوی یەکان قوتاری دەبێت.

چوارەم:-

خۆزگە هەموو ئەدیب و شاعیر و وتار بێژێك وەك مامۆستا مەغدید و مامۆستا شەریف و مامۆستا وریا و خدر کۆساری و محمد کرێکار و هاوەڵاتیان قسە و کردەوە و وتار و ڕەفتار و هەست و نەست و هەڵوێستیان یەك بوایە و ئەوەی بە خەڵکی دەڵێن بیکەن بۆ خۆشیان بیان کردایە!

لە کۆتاییدا:

بێگومان شیعرەکانی(کۆساری) هەموویان لە یەك ئاستدا نین و ئی کرچ و کاڵ و ساوا و ئی چاك و چاکتریشیان تێدایە و ئەگەر کاك خدریش دەرفەتی زیاتری کامڵ بوون و پێگەیشتنی ببوایە بێگومان لە کەوڵی دا هەبوو ببێتە کەڵە شاعیرێك ، بەڵام وادیارە خوای کار بەجێ لە جیاتی ئەوە پلەی (کەڵە شەهیدی)[1] بە قسمەت کردبوو ، کە بێگومان نێوانیان ئاسمان و ڕێسمانە.

٢٢/ ٨/ ١٩٩٦

(١) بێگومان هەر خودا غەیب زانە، بەڵام بەپێی ڕواڵەتی بەڵێنەکانی خوا و پێغەمبەرﷺ لەسەر بنچینەی گومانی چاك بردن دروستە بڵێی: شەهید فلان.

# کورتەیەك لە ژیانی (کۆساری) شەهید و شاعیر

رێبوار کوێستانی

شیعر ئەمڕۆ ،
وەک باسریشک و
گڤەی ڕەشەبای کانونێ ،
گڕ لە نێو چاوی دەبارێ...
ئێستا وشە و کێش و سەروا
برووسکە دەدەن ،
وەک هەوری تووڕەی بەهارێ...
ئەم کانونە ،
شیعری ڕاپەڕیو برایمۆکە و
کەنار (قولە) و (کوێرەکانی) ی
لێ حەرامە و ، لە دەروازەی شار جێی نابێ
کاتی دادگای پشکنینە و
لە ترسی (یاسا)ی دارستان ، شیعر مەگەر
خۆی لە نێو کانیاوی دڵی
پڕ لە باوەڕ حەشار دابێ
تەماشا کەن ،
دەستی نەفامی و تاریکی
پەنجەی کۆساری دەشکێنێ...
قەڵەمەکەی کە پەرژینی کوردستانە ،
لە خوێنی خۆی دەگەوزێنێ...

ڕووناکایی ،
لە نێو شاردا قەدەغەیە...
ئاخنراوە و نەفەس نادا
چی دەلاقە و پەنجەرەیە...
بەڵام هەرگیز کوردستانم
وەجاخ کوێر و ،
بێ بەهرەی زۆر مەزن نابێ
قەت شیعر و جوانی و داهێنان
لە وڵاتی ،
(خانی) و (نالی) و (مەولەوی)دا
نافەوتێ و شوێنە ون نابێ...

ساڵی ١٩٦٧(١) لە گەرمەی ژان و ناسۆری گەلی کورد و ، دەبەرێکڕاچوونی ڕەش وسپی و ڕاست و درۆ و پێشمەرگە و کرێ گرتەدا ، لە رانیەی ئامێزی کێوەڕەشدا ، منداڵێك چاوی بە (قولە) و (کوێرەکانی) هەڵێنا ، کەس نەیدەزانی ڕۆژێك بەهرە مەزنەکەی وەکو کانیاو دەتەقێت و ، لە پەنا هەر دڕکێك گوڵێك دەڕوێنێت و ، کوردستانە بێ نازەکەی دەکاتە گوڵستان و ، سەرەنجام داستانی نەمری ئیسلام و ئیسلامی بوونی نیشتیمانەکەی (شێخ سەعید) و (نوورسی) بە خوێنی خۆی وا بە زەقی لە سەر تاشە بەردەکانی کوردستانەکەی دەنووسێ ، کە جاهیلیەت چاوی بە خوێن بنگوێت و ، وەك شەمشەمەکوێرە لە قوژبنی تاریکی نا ئومێدی خۆی بخزێت و ، لەوەدیهاتنی زیندە خەونەکانی تەما بڕ بێت...

(١) لە ناسنامەی دا لە بەر سەربازی بە لە دایك بووی ساڵی ١٩٧٠ یان تۆمارکردووە .

دژواری و سەختی ژیان مۆڵەتیان نەداوە لە پۆلی یەکەمی ناوەندی پتر درێژە بە خوێندن بدات و ، ناچار شانی داوەتە بەر کار و کاسبی و ، بەینێك بە سەر تاشی و ماوەیەکیش بە زێڕنگەری و هەندێك ئیشی دیکەوە سەر قاڵ بووە ...

ئەو ڕابوونە ئیسلامی یە بە گوڕەی لە سەرەتای هەشتاکانەوە هەموو بەشەکانی کوردستانی سەر بە عێراق و بە تایبەتی ناوچەی ڕانیەی گرتبۆوە ، ژێی هەستە ناسکەکەی کۆساریشی وەکو چەندەها لاوی خوێن گەرمی دی لەراندەوە و ، تاوازی بە سۆزی وریا بوونەوە و چاوکرانەوەی لێ هەستاند و ، ساڵی ١٩٨٧ کۆساری وەك لاوێکی ڕووناکبیر لە باوەشی گرت و ، لە تاریکستانی جاهیلیەتی دەرهێنا و ، خستیە سەر ڕاستە شەقامی ڕێڕوونیی خودایی...

گەلێك جاران دەیگوت (بە ڕاستی هیدایەتدان بەس شایستەی خوای گەورەیە ، من گەنجێکی تازە پێگەیشتوو بووم ، تاقانەی بابم بووم ، زۆر نازیان دەدامێ ، هەموو شت لەبەردەستی خۆمدا بوو ، بە ئارەزووی خۆم هەڵس و کەوتم لە پارەو پوڵدا دەکرد ، بەڵام هیچ تامێکم لەو ژیانە نەدەکرد ).

هەر ئەو گەڕانەوەی بەرەو خواش بوو وای لێ کرد نەتوانێ لە سەر سەربازیی بەردەوام بێت و فێرار کردن بە ئەرکێکی شەرعیی بزانێ .

کۆساری گەلێك جار وشەی نایاب و دەگمەنی بە کاردەهێنان و یاری بە وشە دەکرد ، کە لەوەدا وێڕای گەڕان و سووڕانی خۆی ، سوودی لە دایك و باوکی وەردەگرت ، کە هەریەکەیان سەر بە هۆز و ناوچەیەکی کوردەواریی بوون ، دایکی ( دزەیی) و بابیشی (پشدەریی) بوو ...

شەهید کۆساری زۆر بەخشندە و دڵفراوان و هەژار دۆست و دڵناسك بوو ، لە دوای کۆڕەوەکە لە گەڵ هێزێکی پێشمەرگەی بزووتنەوە لە نێو ڕانیە مابۆوە ، خزمەتی چەند پیر و پەککەوتەیەکی هەژاری دەکرد ، لە سەردەمی ڕژێمیشدا مشووری دابین کردنی خۆراکی بۆ ( مام صالح) ناوێکی نابینای رانیە دەخوارد و خزمەتی دەکرد ، هەروەها جگە لە کۆکردنەوەی کۆمەك لە خێرخوازان زێڕی هاوسەرەکەشی لەسەر

ڕەزامەندی خۆی فرۆشت بۆ دەست گرتنی بنەماڵەی پێشمەرگەیەکی بزووتنەوە بە ناوی ( حمە سوور ) کە لەلایەن رژێمی بەعسەوە گیرابوو ...

کۆساری لاوێکی ئازا و چاونەترس و بەزیپك بوو و ، لە شانە چەکدارەکانی بزووتنەوە دا و بەشداری لە راپەڕین گورج و گۆڵ و هەڵسوڕاو بوو ، سەرباری ئەوە خاوەنی گیانێکی پاك و لە خواترس بوو و زۆر بە نوێژی جەماعەتەوە پابەند بوو و، زۆربەی دوو شەممە و پێنج شەممان بەرۆژوو بوو ، هەر دەگەڵ چاو روون بوونەوەی بە تیرێژی خۆری گەشی رابوونی ئیسلامی لە ساڵی ١٩٨٧ دا ، گەرما و گەرم بینی بە بناوانی زولاڵی ئەو رابوونە پیرۆزە وە ناوەو پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی بزوتنەوەی ئیسلامی یەوە کردوە و ڕۆڵێکی دیار و بەرچاوی لەفراوانتر کردنی جوغزە نورانی یەکەی ئەو رابوونە لە رانیەدا دیتوە وهەر هەمان ساڵیش خێزانی پێکەوە ناوە و کوڕو کچێکی بە یادگار بەجێ هێشتوە بە ناوی (شەیدا) و(بەنان).

هەر زوو پەری شیعر خستویەتە ژێر سایەی شاباڵی خۆی و ، کۆتایی ساڵی ١٩٨٧ یەکەم شیعری بە ناوی (نیگاری خودان) نوسیوە و دواتریش شنەی راپەڕین ژیلەمۆی بەهرە و شیعری کۆساری گەشاندەوە و چاوو دڵی تامەزرۆیانی پێ روون کردەوە و ، بۆ یەکەم جار نرکەی شیعری لە راپەڕینە پرشکۆیەکەی پێنجی ئازاری رانیەدا، بەسەر شەپۆلی نەعرەتەی دەنگە بەسام و هەیبەتەکەی خۆی دا لە بڵیند گۆی مزگەوتی گەورەوە بەرز بۆوە و دەروازەی راپەڕینی هەژاندەوە و،گڕوتینی وەبەر جەماوەری راپەڕیو دەخست ...هەر لەدەروازەی والآی راپەڕینەوە تیشکی زیاتر کەوتە سەر شیعرەکانی وساڵی ١٩٩١ هەندێکیانی بەدەنگی خۆی لە کاسێتێکدا بەناوی (سەدای کۆساری) تۆمار کردن و ، لە ساڵی ١٩٩٣ یش بەشی دووەمی (سەدای کۆساری)ی هەر بە دەنگە پڕ لە خرۆشەکەی خۆی بلاو کردەوە.

ساڵی ١٩٩٢ماوەیەك سەرگەرمی نووسین و پێشکەش کردنی بەرنامەی کۆمەلایەتی توانج ئامێزی (لێرە و لەوێ) بوو لە تەلەفزیۆنی بزوتنەوەی ئیسلامی لە رانیە، کەدواتر ئەو ئەرکەی بە شەهیدی مەزن کاك (تەها بابەکر) سپارد کە تا

شەهید بوونی لە کاتی ڕووداوەکانی مانگی دوازدەی ١٩٩٣ دا زۆر بەگەرم و گوڕی ڕایدەپەڕاند.

لە زۆربەی کۆڕ و ئاهەنگەکانی ناوچەدا جگە لە کۆڕە شیعرییە تایبەتیەکانی خۆی بە دەنگە زولاڵ و شیعرە بە هێز و پێزەکانی گوێگرانی هەژاندوون و خستوونیەتە ژێر بەهرە گەورەکەی .

یەکێك لە دیاردە دیار و دەگمەنەکانی شاعێرێتی کۆساری ئەوە بوو کە سەرپاکی شیعرەکانی خۆی لە بەربوون و هەمیشە بێ نوسینەوە و لە بەر ڕا، شیعرەکانی دەخوێندنەوە .

کاتێك لە کۆتایی کانوونی یەکەمی ١٩٩٣ دا،قەفی زنجیری تاریکی لەگەردنی کێلی کێوەڕەش هالاّ و، دەروازەکەی ڕاپەرین ئەوەندە نووتەك بوو ، تروسکەی لێ بڕا و شەقامەکان هێندە وێك هاتنەوە کە بواری هەنگاو گیرا ، کۆساری وەك تیرە ئەستێرە سنگی نەفامەتی شەوە زەنگی سمی و، لە ئامێزی دەروازەوە خۆی هەڵدایە سەر شانی دەڤەری مەندەمەرانی ئیسلام پەروەر و لەوێ لە ئامێزی ئەودا گیرسایەوە ، بەلاّم سەد حەیف و هەزار مەخابن دەرفەتی لێ هێنراو لەوێ لە١٢/٢٧ شەهید کرا، دوای شەهید بوونیشی هەر بۆ ئامێزە پڕلە سۆزەکەی کێوەڕەش گەڕایەوە و ،لە گۆڕستانی ڕانیە بەو خاکەیان سپارد کە هەتا ژیا شیعری بۆ گوت و چقڵی چاوی ناحەزانی بوو .

سلاّوی خودای ستەم ڕوخێن و تۆڵە ستێن لە گیانە پاکە بەرزە فڕەکەی شەهیدی شیعرو وشەی ڕەسەن و داهێنان و هەموو شەهیدانی ڕێگای خودا و چەوساوان .... وردو خاش بێت دەستی ڕەشی ئەبوو لەهەب و هەموو دەستێکی دیکەی هەق کوژی و تاوان .

نیسانی ١٩٩٨

# نیگاری خودان[١]

ئەی خودای تاک و بێ هاوتا خاوەنی بەرزی و ویقـــار
ئەی ماخۆی بڕست و توانا هۆی بەرقەراری ڕۆژگــار
خاوەنی عەردو ئاسمانی مانگ و ڕۆژ و شەوی تار
ژێر تینی تۆن چیاو بەندەن مێرگ و زەنوێرو نزار
ملکەچی ڕوگەی پاکی تۆن ئەی خودای بێ خەوش و خاڵ
قولاّیی و گرد و تەپۆڵکەو بەرزیی و تەختایی و بنـــار
لوتکەو نەرمان و بەستێن و زەمەندو جۆم و زەندۆڵ
نشێو و تەلان و پەسیو،گـەوەو هەڵدێر و نســـــار
دوندو ماهی وباسک و عاسێ زورک و شیو و خـڕو دۆڵ
دەریا و دەریاچکەو ڕوبار و گۆم و تا ڤگـەی پڕ سـەهۆڵ
کانی و چۆم و ئەستێر و کانیلکە و جۆگە و لێژاو
بان و شێخاڵ و زیخەڵێن ، لیتە وشڵتاو و زەلکاو
بێ هەڵدا بەڵگەی ئاشـکران بۆ مرۆڤێـکی تـــەواو
لاوێکی ورياو هۆشمەند بە لە هەر چوار دەورتە داو
گژو گیاو گوڵی هەزار ڕەنگ سەوزەو میوەی هەمە جۆر
هەر لەڕەنگی سەوزی تۆخ و سوور وزەرد و سپی و مـۆر
سەر قاڵی وێردە ژمێری تۆن ئەی پەرسـتراوی نەگـــۆڕ
مەفتوون و شەیدای وێژەتم وەک ڕووەک ناژی بێ خۆر
لە ئێستا ڕا هەتا ئەو عانەی دەچمە نێو کفن و گۆڕ
بەڵگەشن ئاوەژوو بوونە دەگەڵ ئادەمی دوو مـــۆر

---

(١) واتە نیگار و نەخشی خاوەنی بوونەوەر کە خودایە.

شـەبەق و کـازیوە و گزنگ ، زەردە وبولێڵ و هیــلال
قەد پاڵ و زینو و کاو و وەرد بەراو، ئەستەم،دێمە کار
دۆک و ئاونگ و شەونمی لقی درەختی جۆیبــــار
سرۆچکە و چرۆی نەمامی خونچەی لاری گەش و ئاڵ
پاناوک و نواڵە و بژوێن چـڕ و پـڕ و لێـڕەوار
نەسیم و بۆن و بەرامی هەوەڵی وەرزی بەهار
تورِی داوێ ژان و دژوار دڵی چزیلکی کۆســار
لەو پێچەی مەغزی کرِیوە قولاغی پەروەردگار
ئەستێرەی بەرزی پرِشنگدار ئاسمانی شینێکی کاڵ
دەبنە زۆر پەرِتوکی بـەرچـاو بۆ دواندنی برِوادار
پێرو و تەرازو و گەلاوێژ هەڵواسراون بەرەو خوار
ئەی کاکێشانێ بۆ ناڵێی کـە هـەزاری بـە هـەزار
چەندەها سـتارەی کـە هـەن نابیژرێن بە خـــام وزار
هەموو ساتێ لە فەرمان دان بە درێژایی مانگ و ساڵ
بە مـوو بە هـەڵـەدا ناچن وان لـە خـەتی ســنوردار
بێ یەک دیکەش دانامەزرێن لە سۆنگەی جازیبەی زاڵ
هەتا ئێسـتا سـەرنجت دا ئـادەمیزادی هـۆشــیار
ئەم گەردوونە نەخشی خوایە یا رِێکەوتی کەرِ و لاڵ؟!
هەرچی مرۆڤن شارەزان بە نەزان و خـوێنـدەوار
لە رِاستە شێواز تاراو بی دەکەویە نێو درِک و داڵ
لە ئاسۆ رِا دیارین بۆ هات بە فریشتەیەکی هێزدار
دەبا تۆسـقاڵێ پێزان بین بەر لـەوەی بچینـە چــاڵ
خۆر سەرگەرمە بە کاری خۆی لەگەڵ زەوی وەکو یـەک
هەیڤ و ئەو ئەستێرانەی هەسارەی خۆریشیان لە تەک

شـەو و ڕۆژ و وەرزی سـاڵیش ڕادەبرن لـە دوو یـەك
کە سەیری ئەو یاسا بڵیند و پڕ سەلیقەیە دەکەی تـۆ
ناچـاری ملت کـەچ بکـەیت بڵێی خـــودا یـەکـــە یـــەك
بۆو نادیارەی حەوت ئاسمانی دروست کردوون لەسەر یەك
گەرما و کڕوزێنی ئارانێ ، زوخم و سایەقەی زۆزان
کزە بای تاو تاوی بەهار ، با ڕەشەی چلەی زستان
تراویلکە و کەوانەی ڕەنگین ، مژ و هەور و خوڵ باران
لێمشت و لافـاو و تـۆفـان ، دادڕی کـەنـد و بسـتان
ویشـومە و گێژو گەردە لول باپزو و ورەی زریان
بولەرزە و ئاگر پرژێن و با سـریشکی بێ ئـامـان
بیم و تـەیـار و خـەسـڵەتی خـودا دەئـاخنـە دڵان
ئەو پەرستراوەی کە وزەی دەرۆستی نایێ زمـــان
هەر لە خێو گیانێکی زیندوو ، تا دار و بەرد و کەلاك
چ بانێکی گەرم و بێروون ، یا باغ و چـەمی ڕوونـاك
جووتە زەریای نا ئاوێتە و ئاوی سوێر و لێڵ و پاك
تان وپۆ ئاسمان با بیانەو زەویش بە تەنهایە داك
لێم حاڵی کە و بەڵەدم کە گەنجی هەبووی هیزری چاك
گەر گورێك زەوی قوتی داین وەدەر ناکەوین لـە خـاك
کوێرە هۆشی کەسێك وایە شانتەکێن بێت لە زکماك
یانە بێ خەشـمەتیش ئـاوا لـە ئـاقـار زاڵی بێ بـاك
هەر لە خۆش یەکی زۆر بە تین تا دەگاتە دەرد و ژان
چ سـەلاقێکی بـەردەســتە یــا ســانی ڕۆم و ئێـران
یا گرتووێکی پێست داپڵۆخاو ، چ وەردیانی جەفـا دان
یـا تـەلارێـکی نهۆم دار ، چ دەوار یـان کـاولـــەلان

چ قاقایەکی بێ فەهێت یا پرسە و شین و گریان
بۆ تاقی گەری تۆ هاتن زەندیقی یان موسـڵمان
ئەی هەستیار کە خوا ڕۆینای لە سەر لاپەڕەی جیهـان
بە ویسـتی جێنشینی خۆیی و لـەبەر ڕێزی ئینســـان
بێرە وێکرا با زوو لێکنێین بۆ چرای لوتکەی ئیمـــان
بەشو حەزکا بـەرژەنگێبین بۆ قەتاری دەرووی ژیـان
سەرنجدە پەیکانێکی کەم کە دەردەچێ لە کـەوان
دەبێ حەوجێی چەند فەرمانبێ تا دەپێکێ نیشـــان
ئەی لە گۆترە یەکخراون هەنگوینی بە تامی شان
یا بێوچان لە بێ شـەدان ڕیوە ڵـۆکـەی بێ زمـان
چ جاران ئەی ڕانەماوی لە مێرولەی شـارۆچکـــان؟
وەک بەنموری ڕەشی پەرتن ڕۆزی دەچنن بۆ ژیان
یانە هیچ کا نەت بینیوە قورباقێکی ناو دوورِ گۆلان
لە عانێکی کە ناسـاغە و هاتووەتە سـەردەمی زان
بۆقێـکی دی وەک پـزیشـک لـە بـۆی دەبێتـە مـامــان
گەر بەوەش ژیریت نەبزوێت کاشکێ وەبای نەک ئینسان
جدەو و دزێو و جاکەش یا ڕەند بی هەروە کو زێڕ
یا نەوجەوانێکی بە گوڕ، بی قرپێنن چـاوی شـــێر
یا ئەسـکەرملی ئاواتی بێ وەکـو تـەریـدە و زۆڵ
یانەکینێ تاجی گەوهەر وەک هیتلەری گۆڕ بە گۆڕ



**به کام کلۆجان ڕزگار دەبێت لە پێش بارەگای خودان**

**بێلەل ئەوە دەرباز بووە کە خۆی بۆ کرد بە قوربـان**

**هۆنراوەی کۆساری وەختە دەستبەردار بێت لە لاتان**

**لە شانۆی دنیادا شادی و لەوێش بەهەشت جێگاتان**

* * *

# گزنگی خێزان[١]

ئەی دەروون شوشەی غەم ڕەوێن
ئەی گۆنا ئاڵی چاو شەهێن
ئەی ئەندام چوکەڵەی دڵ پاك
ئەی خۆشەویستی چوخت و چاك
ئەی لێو بە بزە و پێکەنین
ئەی چەپکە گوڵی یاسەمین
ئەی ڕوو خۆشی بێ بوغز و قین
ئەی فریشتەی سەر ڕووی زەمین
ئەی چراوکی دیوانی خێزان
ئەی بووزی ترۆپکی کوێستان
ئەی پەریی پاکی بێ هەڵە
هەی بەفری سپیی بێ پەڵە
ئەی توێشوی گەشتی ڕژد و دوور
تۆی بەدی هاتووی بێ قسور
هەست و هەناوت پێ میرە
کێسێک مەمکۆڵ قاڵ لە شیرە
بە لەپەی قەشەنگ دەیگری
موژگان بۆ ئاسۆ هەڵدەبڕێ
بەندەی خودا تۆرەی منی
ئەنگاوتەی سۆمای دوژمنی

---

(١) کۆساری ئەم شیعرەی بە بۆنەی لە دایك بوونی ( شەیدا)ی کوڕی نۆنەبەرەیانەوە داناوە ، کە لە ٢٥/١٠/١٩٨٨ هاتۆتە دنیاوە .

تاکەترووسکەی ناخی ئەوی
سـوورە گـوڵی باخـی ئـەوی
پـەڕاوی سـفت و خـاوێنـی
چلۆن بتوێ وا خۆت دەنوێنی
ئەی پەریی پاکی بێ هەڵـە
هەی بەفری سپیی بێ پەڵە
ئەی توێشوی گەشتی ڕژد و دوور
تـۆی بـەدی هـاتـووی بێ قسـور
ئەی هەتاوی سینەی بـابـە
ئەو بابەی جەرگی کەبـابـە
ئەو بابەی پەژموردە ڕەنگە
کـز و قەیـران و بێ دەنگە
لاڕووی چاڵ و پشت چەماوە
بە دیمەن چـەنگێکی مـاوە
خۆ بابە بەس ئەوی دەوێ
بێ وی پێڵوی ناچنە خەوێ
بۆ شەقڵ و مۆرکی دەنـاڵێ
ڕۆندکـی چـاوی دەبـــارێ
ئەی پەریی پـاکی بێ هەڵە
هەی بەفری سپیی بێ پەڵە
ئەی توێشوی گەشتی ڕژد و دوور
تـــۆی بەدی هـاتـووی بێ قسـور
ئەو بـابـەی کـە ئـامـانجێتــی
ئەو لێی خۆشنود بێ بەسـیەتی

بەڵام حەقە گەر واهــی یــە
چۆن پەرێزی سەرکێشی یە
کــرۆکـی دابــڕانـــە کـــــەوا
نسکۆ و نووچ دەدا کە دەڕوا
پێت نەگەیوە بە یادی یار
دڵان سێبوور دەبن لە ژوار
بەبەگیان ،ئەتۆ زاف جوانی
ڕێــز لێـگـیراوی یـەزدانـی
لەسەرمە جێی بێنم تا هەم
( من لا یــرحم لا یــرحم )[1]
ئەی پەریی پاکی بێ هەڵـە
هەی بەفری سپیی بێ پەڵە
ئەی توێشوی گەشتی ڕژد و دوور
تــۆی بــەدی هـاتووی بێ قســـور

*  *  *

(١) فەرموودە : واتە ئەوەی بەزەیی بە خەڵکدا نەیەتەوە ، بەزەییان پێدا نایەتەوە.

# شەبەقی سەرفرازی[١]

سێ تکەن ئازادی هێنن
فرمێسك و ئارەقە و خوێنن
خاوەنی وان سێ دڵۆپان
لە خۆی دا هێناوە قورئان

تاکە میرە لە پای ژیان
ئەستۆ بەرزە لە ڕووی خوستان
ئەوەی دەفەی کرد بە قەڵغان
لە بۆبەرزی وشەی ئیمان

بەڵێ ! (محمد) پەیامبەر
ئەی ترسێنەرو مژدەدەر
شوێن پێی پیرۆزت هەڵدەگرم
گەر مێشکم لە لووت بێننە دەر!

دوو چاو ئاگریان ناگاتێ
ڕەوا بینن هەموو ساتێ
لە نێو سەنگەر ئێشکگرن
تاو نا تاوەش دیدان دەوڵن

قارەمانن بەهەشت کڕن
خۆ چەمێنن کڕنۆش بەرن
بۆدڵڕەقان لەسەر تەڵن
خوایاربێ ملیان هەڵ دەبڕن

(١)کۆساری ئەم شیعرەی لە پێنجی ئازاری١٩٩١و ڕۆژانی دواتردا لە مزگەوتی گەورەی رانیە خوێندۆتەوە و مەخابن بە شێك لە شیعرەکانی پێش ڕاپەڕینی لەگەڵ سەرقاڵی ڕۆژانی ڕاپەڕین لێ ون بوو ون.

بـەڵـێ (محمـد)ی ســـــەروەر
ئەی ڕاستی ویستی داد پەروەر
بازی سـەختت دەگـرمـە بـەر
گەر بە نوێڵ جەرگم بێننە دەر

دوو سێ وشەن ڕاستی هێنن
دڵـی بـــڕوا ڕا چـــە نێنـــن
تـەختی کیسـڕا ڕاهـەژێنـــن
کـۆشـکی قـاڕوون داتەپێنـن

هـەزارەهـای وەکـو نـەمـــروود
لــە گیـانــەڵا بــڕوا دێـنــــن
گەر پرسیارهێژی ئەو دووە چیـن
بـۆ وێـڕای وی پـەرەسـتن نیـــن

بـەڵـێ (محمد)جـەنـگـــاوەر
ئەی داری ڕۆچووی بە سەمەر
بەڕێی ئەستەمت دێمە سـەر
تا دوا هەناسـەم دێتـــە دەر

سـەدەهـا پـاشـای مفتـە خـۆر
لـەتـاو تـەخـت وەزگ دێنـــن
فیـرعـەونـی ئیـروو و پـایەدار
لـە زێـی میصر دەخنـکێـنـــن

پـەتـی سـێدارە پسـێنـــن
زیندان و چوار مێخ ڕوخێنـن
بە بلیۆن ( سـاتۆر نـازم ) ی
بە مەرەدی کورد دەچوێنـن

بـەڵـێ (محمد) تێکـۆشـــــەر
نـاوک بێگەردی شـێـر جگـــەر
چەک لە مستم بۆ ڕێی بە فەڕ
تـا تخێـڵ بـم تـونـدە بـــاوەڕ

هەورە تریشقەی کێو جمێنن
بـورکـانـی زەوی دڕێـنـــن
وێنەی ئـافـاتـی ئیتـاڵیـــا
شـاری مـەسـینا[1] سـوتێنـن

چـۆم و زەریـا بـە خـوڕ هێنـن
گـەر ویسـتی بـێ تـرس بێنـن
شـێوەی سـێڵاوەکـەی( نـوح )ن
هـەمـو گێتـی دەفـەوتێنـــن

بـەڵـــێ (محمد) بـە خـەبـــەر
نێردراوی خـودای بـەزەفـــەر
ئەمنم شوێن کەوتەی کۆڵ نەدەر
تا جـوانـاو لـە ڕووم دێتـــە دەر

ملیۆنەهـای ڕەنگ هـۆلاکـۆ
وەک ناپلیۆن بە چۆک دێنن
چ مۆسـۆلۆنی یا جـــەنگیز
لەگوفکی مێژوو ناو دێنـــن

سـەرای جـەور هەڵتەکێنن
عاد و سەمود بە قڕ هێنن
نـاصریی داوێنـە دژوێـــن
بە چـەلی دڵ دەتۆپێنـــن

---

(١) شارێکە لە دوورگەی (صقلیە).

بەڵێ محمد تـــاجــی ســــــەر
ئەی ڕەوشت بەرزی بەجەوهەر
بە شوێن ئەسەری ڕێت دەڕۆم
نـام گنخێنێ تەوس و تەشــــەر

دوو ئەشتن شـادی بارێنـن
کۆیلان لە مەرگ دەستێنــن
بەیداغی بەرزی خودایــــی
لە کەللەی دوژمن چەقێنــن

بیردۆزی ئەفسـانەی دستکرد
وەک کوانی زەرد دەتەقێنــن
ناوی ئەو دوو شتەش بزانــن
تفەنگی شــــان و قورئانــــن

بەڵــێ (محمد) بــەجــەوهــەر
بە محتەوای ڕاستگۆی سەروەر
لــە پێناو (زێد) دا هــاتــە دەر
تـا خـودا نـەمخـاتە سـەقـەر

دەسا واز لە جـەور بێنـن
تا کەی ستارگە دەڕوخێنن
چما دڵسـۆزی چۆڵـە پێچ
لە زیندانی تـار دەڕزێنـن

هەتا کـەینێ پشتی سـەیــد
لــەژێـر تێـلا دەگـروێنــــن
تاکەی زەری و کەنیشکی کورد
لـە بەندەکـان ئەتک دێنــــن

بەڵێ (محمد) حەق سێنەر
دارێژراوی قاڵبی قـەدەر
گوفتارت دەنێمە بان سەر
تـا تابەردم دەنێنـە سـەر

تاکەی زۆر هـان و هـەتیـوان
لە برسـاندا ڕەق هەڵـدێنـن
تاکەی گەردنی کەڵکەڵەی جەنگ
گـوریسـی تـێ دەئـاڵێنـن

تاکەی باغ و بێستانی کـورد
بە مەرگە موش لە بن دێنن
تاکەی دوندانی کوردسـتان
بەکیمیا هـەلـدەقـرچێنـن

بـەڵـێ (محمـد) کـۆڵـنـەدەر
بۆ زەحمەتـکێشـان نەجـات دەر
مەرج بێ بە دوژمن نەدەم هەل
تا سـینگـم دەبێت دیـواو دەر

تاکەی ئاوەڵ کـراسـی ژن
بەبۆدیی جێب ڕادەنوێنـن
هەتا کەی کوردی بە لەنگاز
بـە دەنگـی مین دەتۆقێنـن

تاکەی بولبولی باغی دیـن
لـەگولاوی ژین دەتۆرێنـن
هەتا چ حەل پیری کەنەفت
جەرگیان بە کوچک دادێنـن

بەڵێ (محمد) ڕاهێنەر
ئەی خەولێ کەوتووی بەخەبەر
ئاوردووی شارێم هەتا سەر
تا گیانم لە لاک دێتە دەر

هەتا کام دەم تولفی بێ تەم
لە بێشکێدا دەبڕژێنن
یان نەوجەوانی بێتاوان
لە خوێنی گەش دەگەوزێنن

زاڵمی مسقۆف بار ناهێنێ
بەنەرمی شان داناهێنێ
مەگەر بەچکە شێری قورئان
مێشک ومۆخی بپڕژێنێ !

بەڵێ (محمد)ی ڕابەر
چینی چەوساوە ڕزگار کەر
چۆڵناکەین نێو بنکەو سەنگەر
تا خۆر لەباشور دێتەدەر

* * *

## قوتابی و مامۆستای شەهید[(١)]

شـەوێک لەهێکرا پرژا بیرم ئەمــن
کە بەندەی خودام کەچی دیلم ئەمن
بەئازادی لەرەحمی دایکـی شـیریـــن
سەرم هەڵدا بۆ دونیای فەوت و بەرین
بەڵێ لەئـامێزی بـەزەیـی خـودا
وەدەر کەوتم رەشماڵی ژینم هەڵدا
خودای مەزن پێی بەخشیم بەهرەی گران
لەدەســتم دا با بـەکـۆڵـدا دەم تـــاوان
بەگوتەی وانم کرد بۆیە خۆم دەبینــم
خولام کارو بەنێو ژێردەستە و زەبوونم
خـۆم بەهەڵە بارو لارێ دەزانــم
بۆیە کەساس و مات و پەرێشانم
بەقسەی لووسکەڵە چەواشەیان کردم
ئەوان بـێ بـەلا شـاڵلا مـن دەمـردم
هیچ نەبوو رزگایەك دڵم داتـەوە
ئـاکـاری دزێـوم لـەبیر بـاتـەوە
لەسەر پێخەف شانم داداو داسەکنام
هیچ چارە ونۆژدار نەهاتن بەهانـــام

---

(١) شەهید کۆساری ئەم شیعرەی لە ساڵی ١٩٨٩بە بۆنەی شەهید بوونی کاك (ئەحمەد شاسوار) نووسیوە کە لە ١٩٨٨/٧/٢٢ لە گردی ڕەمکانی ناوچەی پشدەر بە دەستی بەعسی یەکان شەهید بوو و ناوبراو برایەکی زۆر نزیکی شەهید کۆساری بوو.

نزیک بوو وەنەوزە و خەو بمباتەوە
وتەی مامۆستاشم وەبیر هاتەوە
زێدە جاران کە لەناومان دادەنیشت
وەک لێزانێکی ئاوەزی خواپەرست
بە نەرمی و خەندەوە لەگەڵمان دەدەوا
کێشندەی دەکردین بۆ ناسینی خوا
بڕیار وا بوو لە ڕێبازی لانەدەین
ئامۆژگارییەکانی فەرامۆش نەکەین
ئاواتی بوو وەک وی بم هەتاکو هەم
ئێستاش بوومەتە بەندەی قوباد و جەم
دڵم پڕ بوو گەرووم گیراو چاو مەین
ئەسرین وەک زەنگوڵ بەسەر ڕووم ڕاخزین
مامۆستا گیان لای خودا بکە ڕجام
مامۆستای بەرزی شەهیدی ڕێی خودام
مامۆستای زویری لە تاوان ڕەنجاو
مامۆستا بۆ جوێیت سوور هەڵگەڕان چاو ؟!
مامۆستای نیان ورد و دڵ بەرین
مامۆستای سینە پاکی بێ ڕق و قین
مامۆستای ئەوینی بەرنامەی خوا
مامۆستا لای تۆ بوو تیمار و دەوا
مامۆستای ئاشنای سوننەت و قورئان
مامۆستای پەڕکوڕی ئاڕییجی لە شان
مامۆستای پشوو درێژی شەیتان خەسێن
مامۆستای زەهلە بڵیندی کوفر ڕەوێن

ماموستای گرچووبڕی تاغوت ڕەتێـن
ماموستای بە هەڵمەتی هێرش شکێن
ماموستای چەوساوەی ماف پێشێل کـراو
ماموستای بێ ترس و پەروا و کەڵە پیاو
ماموستای شەرمن لە ئاستی بڕوادار
ماموستای مل پەڕێنی کافر و زۆردار
پیرۆزت بێ پڕ بە دڵ دەڵـێ کـۆســار
گەر خوا حەزکا لە سەرتە تاجی ویقـــار
سـەرای ڕازاوەی خەباتت سـەری گـــرت
ملوانەی جەربەزە و شکۆت لە گەردن کرد
(موسعەب)ێک بووی لە بوێژە و لە گوفتار
(خەباب)ێک بووی لە ئاقـار ئێش و ئـــازار
(خالید)ێک بووی تێکدەری قەڵای زۆرکـــار
خاوەن بەڵێن بووی لەگـەڵ پەروەردگـــار
ماموستای دڵسۆزی کردەوە شـیریـــن
شاسواری پێست تۆزاوی بەرگ ڕەنگین
ماموستا گیان لە گردی ڕەمکان گلای
بە زەبری چەنگی سیخوڕان ئەنگوای
خۆزگە ئاگام لێت با کە ڕادەقەنـــای
گوێم لە ناڵەی زوڵاڵت با ئەودەمـای
بـۆ دوایـیـن جـار لـە بـاوەشـم دەگـرتـی
کـۆتـا وتـەی هـەڵچووم لە گـوێ دەگرتی
ناو چەوانی بە فەرم ماچ دەکردی
ماڵ ئاوایی یەکجاریم لێ دەکردی

لێم تێبگەن گەر من زگارم لە ژیـن
ناکەم زاری لە بۆ مامۆستای دێرین
بە ویستی خوا پاش ناڵە و نرکەی بە سۆی
خودای بە سـۆز فریشـتەی ناردووە بـۆی
پێڕای سـەلام و مژدەی بـۆ نـــاردووە
بە فیردەوسی نەبڕاوەی شاد کردووە
بێ شک بۆ زەخمی خۆم دەکەم گەرمە شـین
هەنواری چەوت دەستیان خستوومەتە بیـــن
کاتێک دادێ ڕاست دەبمەوە لە ڕێی خوار
پشتیوان بێت خێوی تــاقـی بـەرقـــەرار
خوێش و کەسـت ئەسـتەمە بن کـەسـەردار
چوون شای شەهیدی شارێ (ئەحمەد شاسوار)
خەفە خانیەکەش وا خەسترە بۆ مـن
بێو لە پەسلانیش نەتبینمەوە لە بـــن
سکالاَ خوازم هەنیەت ببینەمـــەوە
لە باغاتی زڕاف پێک شاد بینەوە
خوێنی چواران ڕژا لە گردی ڕەمکان
شاهیدن بەرد و داری قەلاَتـوکـان
لە پەرتاڵدا لـە مـن ڕا و بـڕواداران
لە سەراپاو پیرۆز بێ جەژنی قوربان[1]

* * *

(١) چونکە لە سەروبەندی جەژنی قوربانی (١٩٨٨)دا شەهید بوون .

# ڤیانی ڕاستەقینە و پیڕی سیلبۆ[١]

ئەگەر بە ماتم دیدەکەن دەمێك دێ دەکەومە گەڕ
چەشنی شێری ناو بێشە یاخود پڵنگی کەژو دەر
ئەویندارێکی شك دەبەم قەت لەزەینم ناچێتە دەر
خۆشەویستی من گیانی یە نەك وەك بابای چاو لەدەر

ئەوانەی قەیاس ڕاخەر بوون تەمەنیان ڕۆیی بەهەدەر
ڕەنگە خۆشیان خەنە دەستەی بەنناو نوورسی و جەعفەر!
ڕێویی نێو کەنەك و کونان ، یانە واشەی جەب نەدەر
هەی لەرەش داڵی زەندەق چوو ، تاهەڵۆی دیدە لێزەر!

گەردن نەوی و بێ نموود دایم سەرباریش نیل بەسەر
بە خو کاکڵ وێنەی وڵسات ، بە بۆیاغ شێوەی بەشەر
جا وان ڕووکەشان دەبینم بۆیە وام هاتۆتە سەر
بوکتم ناوی خۆم تۆمارکەم ببمە دراوسێ ی عومەر

ئەوانەی قەیاس ڕاخەربوون تەمەنیان ڕۆیی بەهەدەر
ڕەنگە خۆشیان خەنە دەستەی بەنناو نوورسی و جەعفەر!
ڕێوی ی نێو کەنەك و کونان ، یانە واشەی جەب نەدەر
هەی لەرەش داڵی زەندەق چوو ، تا هەڵۆی دیدە لێزەر!

---

(١) سیلبۆ:جۆرە ڕەنگێکە بۆ کردنی وێنە بە کار دێ ، بەڵام زوو سپات دەبێتەوە.

گەلێ دەبیەم بۆڵەی پیاویلکەی بیر کزو قەلـەنــدەر
گوایە پووچە ڕەخشی باوەڕ لینگ درێ بۆ قوپکی شەڕ
بەشـکو لای وان وا ڕاژەیە هەڵکورمـانی نیر لـەسـەر
مەزندەیان ئەنگرانە یان کـولافـەی ژیـن مـەگـەر ؟!

ئەوانەی قەیاس ڕاخەر بوون تەمەنیان ڕۆیـی بـەهــەدەر
ڕەنگە خۆشیان خەنە دەستەی بەنناو نوورسی و جەعفـەر!
ڕێویی نێو کەنەک و کونان ، یـانـە واشـەی جەب نـەدەر
هەی لەڕەش داڵی زەندەق چوو، تا هەڵۆی دیـدە لێـزەر!

بـەڵـێ ڕاسـتە مـاڵئـاوایی کـرد لـە ئوممەت پـەیـامبـەر
گیـانـی درەخشـانی فـڕی لـە شـەقەی دا تـا مـەحشـەر
وەلی لـەدوای کـەلـەپوورە ڕەندی زیپك و دیـن پـەروەر
گفتی خـوایـە و نـەمـامێـکـە بـەبـێ گـومـان دێتـە بـەر

ئەوانەی قەیاس ڕاخەر بوون تەمەنیان ڕۆیـی بـەهــەدەر
ڕەنگە خۆشیان خەنە دەستەی بەنناو نووڕسـی و جەعفەر!
ڕێویی نێو کەنەک و کونان ، یـانـە واشـەی جـەب نـەدەر
هـەی لەڕەش داڵی زەندەق چوو ، تا هەڵـۆی دیـدە لێزەر!

*   *   *

## خۆشەویستی بیواری

زگـارە دڵ مـادوورە هـەتـا سـەر
هـەراوە دڵ هـۆشـیارە تـا سـەحەر

وێدەچێ ماخۆی دڵە عشـقە چتۆ عـاشـقێ
نەئالودەی کوچك و خۆڵ و نەدڵداری ناسکێ
وەلی تامەزرۆ و لەزی دیداری مەزنـی ئـەوە
هەرسێ یان قرپۆك بوون بەدی هێنان خالقێ

نـەم گـەرەکـە دڵ نـاشـێ وابـێ گــــەر
غـەرقـی ئـەنـدێشـەی بەزەو بێ خـەبـەر

برِیم ناشکێ و بەتاسەو کولافەی مۆرکی مەعنەویم
دنەم دەدات ختووکە پێ ی وایە هنگۆش کـەویـم
تاجی سووری ڕەسـتاخێز سـەودا ناکـەم بە زێوەر
قوتارە سینەی (کۆسـاری) لەکـابووسـی بەشـــەر

*   *   *

# هۆنەرو پەپولە (١)

هۆی پەپوولە، تار نەویست و ڤیانی نوور
سەودا سەری تیشکی بلوور،
بەتاسەو هەڵچەرخی دەوری قەندیلۆکەی سەرتاقی ژوور
لە منی دڵ شەو مەوەستێ دوور،
ژیکەڵەکە !

هاوڕازی و دەستە برایی ی تۆم پێ وازترە لە ڕاوی شوور
تۆی بێ دارو بارۆکەی زوور
ئێرەییم دێ بە بوێرەیی تۆی لە خۆ بوور
هەی (باری) وەک تۆم کا چەسوور،
ئەی ژیرەکە!

ناجنەفم چی بێژم بەتۆ
بەتۆی کزەڵۆکەی لاوازی ئەتگارو بیچم نامۆ
شاخی چ مامزو بزنان سارێژ ناکرێ بە تیلگی تۆ
جێ ی ڕامانە ، مەڵبەندی فیدایی ئەتۆ
ڕوو سوورەکە!

مێژووی زیندیی سەری کەمت
ژینناەمەی پڕ ژانی کرووزو سوتێنەری بووخی بەتین
کودەتای ڕاو و تەگبیرن

---

(١) یەکەمین شیعری ( ئازاد)ی کۆساری یە کە دوای راپەڕینی ئازاری ١٩٩١ نوسیویەتی .

ڕاپەڕین و بزووتنەوەی تاریکی ڕاونەر لە نوورن
پەڕ کورەکە !
بفرە و زاق بە بەلای هاودەرد
هاومرازی ئاخن و کاکڵ ، پڕ لە سور غەور و ئاهی سەرد
بە جووتە باڵۆکەی قوییت باوەشێنکە
دیاردە و شەقڵ و سەرو سیمای ویردە خوێن کە
نیگا تیرەکە !

دەشقەڵمێنە نەخشەت لێم بێ
تریفەی گەڕناسی تەرزت ڕەنگ دانەوەی لە قەڵغم بێ
بەکالآی گیانی بەختکەری تەنهات کۆک و پۆشتاغ بم
بە پۆشاکی سوور لە گەرمەی خەوێ ڕابم
باڵ شوزەکە!

ئەوساکە بەیەک نەزم و سەدا دەڵێن
چێشتی ساغری نەمری ئەسێرەکە
تۆ مەستی چرالەی شەو نشین
منیش وەک تۆ هەمە ئەوین ، شەیدای شەمنووری بازنەی شین
فێرکارەکە!

* * *

## موشتاغی دەرووی سانی گوڵ

دوورە گوڵ
شۆختر لە گوڵ ،
خونچەی گوڵی ڕووت هێندە گوڵ
لە گوڵزار گوڵبزڕکان
گوڵ چۆوە لە ڕەنگ سوورە گوڵ
گوڵاڵەو گوڵە تۆپ و
گوڵە باغی شای نێو گوڵان
لەگەڵ بوون لەو دەمەی
گوڵ هاتە سوێ سەر تۆپی گوڵ
دیمار بولبولی ئاری
وەژین کاو خەوکوتکە گرتی
نەگەییە ئەشکی ڕووی یار
بەر لە نۆشین خونچە ڕشتی
بەڵام تەماسی بەندە
هەتا گەردی بەیانی بوو
بیستی چوو رێ ی خوناوەی گوڵ
لەو کێسەی ئەوین چێشتی
شەمزین نیمە شەم تا شەم بۆ وەسڵی شەم
شەبەیخوون کەم
شەمی بێ جەماڵی شەم
شەمولەم پێ خاسترە لە شەم
لەو دەمەی شەمچەو شەمنوور و
شەمعی شەوان خامۆشە
شەوگاری بێ شەمسە و شەمن
شەمدارە بە نووری شەم

* * *

# پاکانەی هۆنراوە

هۆنراوەکەم ...
دۆخی تیژی دەبانێکە
جوانەمەرگی ناو سندوقە کالان نی یە
ئاڵتوونێکە
دروست بووی ویستی یەزدانە و
جێگەی کانی کوردستانە و
هەتاکو تێزابی گیانی لە چاڵی لاشەی بمێنێ
بە هیچ دیوان خۆی نافرۆشێت ،
لەمەڕ مەرگە و وەکو کەستاڕەکەی تەق تەق [1]
بە قسەی پیشەسازی ناپاک
نابێت بە ئاڵقە و ئەنگوستیلە و ملوانکە

هۆنراوەکەم تەنوورێکە
لە قوڕی ساخ
بە ئاوی بووزی پشتی شاخ
دروست کراو
شان و لغاوە و لێو شکاو
نانی گەرم بۆ بێ نان و بێ لانەکان دبرژێنێ
تا بۆی بلوێ و گڕی هەستێ
چنگ و کوڵەوەژ و ڕنووکی گورگە مێش و دووڕەگەکان دەسوتێنێ

---

(١) مەرگە ، گوندێکە سەر بە ناحیەی بنگردی قەزای دوکان و بە ناوچەش ناو دەبرێ ، تەق تەقیش ناحیەیەکە سەر بە قەزای کۆیە.

هۆنراوەکەم سۆمای چەکی دامەزراوە بەرە و مەبەست
وەکو دەسرۆ و
لەپی فلّچە و
پەنجەی شانەی بیّ بارەکان
خۆی لە چاو وشان و سەری ملهوڕەکان ناخشێنیّ

هۆنراوەکەم...
پاندانێکی بیّ کلاّوە
دژی مەرەکەبی کەسك
کونی گیرفانی کورتەکی (فەتاح پاشا)[1] و
شالّ و بزووی ڕێسراوی ناسیۆنالیزمی ئەوروپی و
ئیمزا و قامکی زەڕ کراوە
هۆنراوەکەم ...
کێلێکی بە بۆیاغ شەهیدی تیرۆریست
یا دوو سەرکردەی دوانەی ماسۆنی جیهانی فرۆشراو و زێڕ خرید
بە بێ خوا و نەتەویست و دوژمن دادەنێت
وازم لێیە هۆنراوەکەم
بە هەمیشە لەبەر دلّ و چرۆی چلّ و دلّۆپە ئاوی سەر ڕووی گولّ بێت
لە ڕێچکەی سەلّیتەی دوو مۆر
هەژك و دڕك و کلّپەی کلّ بیّ
لە دوا ژیانیش وێنەی (ناصر)[2] وەکو (زانا)[1] تنۆك تنۆك

(١) شێوە جلێکی کوردی یە و بە کورتەکی فەتاح پاشا ناو دەبریّ.
(٢) ناسری سوبحانی موسلّمانێکی زۆر ڕۆشنبیر و تێگەیشتوو بوو خەلّکی شاری سنە بوو لە ئێران شەهید کرا !

**جواناوی سەر قژی پووش و دڵۆپە خوێنی سەر ڕووی گڵ بێت**
**نەرم و کڕ و گرچوو بڕ بێ**
**وەکو قەڵەمی (عبدالله)[۲]**
**زرمەی نارنجۆکی شیعری گەرووی (حەسسان)[۳]**
**لە مەکۆی هەڵوێستدا کوڕ بێ**
**شوانێکی وەکو (موسی) بێ و**
**لە سەر تەختی (موفاوەزات) لە ڕاست (فیرعەون) ملکەچ نەکا و ڕۆحی زل بێ**

**هۆنراوەکەم ئەسرینی چاوی سەرێکی پڕ ئەندێشە و بێ سەرینە**
**دڵدارێکە وەکو خونچە**
**شێوەی قەڵەم**
**وێنەی قورئانی لەش بچوک**
**عەشقی یەخەی عارەقاوی و ناوباخەڵی خاڵی و چۆڵی،پێشمەرگەیەکی ڕێبواری ڕێگا بینە**
**لەوانەیە هەندێک جاران هۆنراوەکەم**
**شوێنی ئەشکەوت و نەدیوبێ**
**یا سەرتات و لێوی ماقۆڕ**
**زگی ڕووتەن**
**یا باوەشی دۆڵ و شیو بێ**
**لەهەر جێ بێت**
**جەنگاوەرە و ختمی دەروونی بۆسەیە و چاو دەگێڕێت**

---

(۳) پێشمەرگەیەکی ئازا و فەرماندەیەکی لێهاتوو بوو خۆی و برایەکی بە ناوی (کاکە) لە پردێ ولە ۱۹۹۱/۳/۳۰ بە دەستی بەعسی یەکان لە ڕۆژانی بەرگری لە ڕاپەڕین و جەماوەری ڕاپەڕیو شەهید بوو !
(۱) شەهید دکتۆر عبدالله عزام ، کە لە ۱۹۸۹/۱۱/۲٤ لە پیشاوەری پاکستان بە هۆی تەقینەوەی لوغم لە ژێر سەیارەکەیدا خۆی و دووکوڕی شەهید بوون.
(۲) مەبەستی (حەسسانی کوڕی ثابت)ی شاعیری پێغەمبەرە ﷺ .

وەک پەپولەی دەروون تاریک بۆ ڕۆشنایی
تینوێکی دەشتی بێروون بۆ شینایی
ڕاو نراوێک بۆ دڵنیایی
ورد دەڕوانێت
پێش ڕکوع و کڕنوش بردن
دوای دانیشتن
لەپاش لەتیٚ نان کرۆشتن
دوای وەی دیدەی پێشمەرگە دەچن بۆ دیدەنی خەوتن
لەپاش ئەوەی پشوویان دا حەزی گوتن و ئاخاوتن
لەو کاتە و گشت کاتێکی دی
هۆنراوەکەم هەلی ببێت
وەکو سیواکێکی پاکی ڕەوشت ڕووناک
دەستی تەزی و پشووی ماندوو و دەم و لێوی وشک و برینگ ڕادەموسیٚ
گەلیٚ ڕۆژان جێگەی ژوانی من و هۆنراوەی ڕەش پۆشی بە پەرۆش
نیگا تەڕی نیگا ڕۆشن ناو سەنگەرە
ژووری غار و جیٚ نسارە
یا ژێر ماهی و سەر ڕەوەزە
یان تەک کەلاوەی ڕماوە
یا ناو دالآن
یا بەردەمی ئاگردانی دامرکاوە
یا سەر حەساری ڕوخاو ە
یا ژێر داری بسک زەرد و قژ سوتاوە
یا سەر قەڵاندۆشی (گردی حوسنی)[1] یەکە و بە دوو قۆڵی هەردووکمان
چاوی پڕ سۆزمان لە چاوی مۆڵەقی شاری تێک ڕماوە

---

(١) گردێکە دەکەوێتە خۆرئاوای قەڵادزێ.

هەندێك جاریش وەکو دەسباری جوتیارێ
کلکی بێڵی کرێکارێ
دەسکی قولابی حەمباڵێ
عارەبانە دارینەکەم دەستم دەگرێت بەرەو جەنجاڵی بازاڕێ
وەك برایەك دەستم دەخەمە سەر شانی
تا پەنا (مزگەوتی گەورە)[1] ڕاناوەستێت
هەر لە هێکڕا
لە عانی سەرگەرمی کارێ
سەیر دەکەم دیسان هەمان هۆنراوەی جوان
هۆنراوەی ئاوارەی بێلان
ریش تۆزاوی
گەرو وشك و چاو پڕگریان
هێدی هێدی
سەری دەنێتە سەر سینگم
سرتەیەك دەکات لەبەر گوێی ڕاست و چەپم یەك دوو جارێ
هەر دەبینم دەستی ماندوو وتەڕم دەسڕێت
بە خێرایی پەڕێك و قەڵەمێکی سەرکۆتی شینیان بە دەست دەگرێت

* * *

---

(١) شەهید کۆساری لە دوای ڕاپەڕین ماوەیەك لەسەر عەرەبانەیەك شتی دەفرۆشت و شوێنی ڕاوەستانیشی بە زۆری بەردەمی مزگەوتی گەورەی ڕانیە بوو.

# شۆڕشی کاکڵدار [1]

هەرکاتێک لە پێش جەماوەر
مێزەری یەک مەلام بینی
لە برینی شەتەک درا بوو
هەر ساتێ دیم
سەرکردەی خۆشەویستی خۆم
خوێنی گەشی
لە پێڵاویدا وەستا بوو
هەروەختێ دیم
برای بە زیپک و چاو نەترسم
ئەستۆی بەرزی
بە قەنارەدا کرا بوو
هەر گوڕێک دیم
خوشکی داوێن پاک و ئازام
بە بێ تاوان
دوای ئازاردان سەربڕابوو
هەرپێچێ شیعری منتان دی
لە سەرەمەرگم گریابوو
ئەو دەمە دێ

(١) زۆر وێدەچێ شەهید کۆساری ئەم شیعرەی بە بۆنەی شەهید بوونی مامۆستا ئەحمەد سینەمۆکی دانابێ ، کە لە دوای نوێژی خەوتنان و لە٧/١/١٩٩٣ نەخافڵ لەلایەن دەستێکی ڕەشەوە لە چوارقوڕنە تیرۆر کرا و مامۆستایەکی چالاک بوو ، ئەوکاتەش لێپرساوی مەڵبەندی (٣)ی بزووتنەوەی ئیسلامی بوو.

دێنی یەکجاری ئازادی
بێ ڕووبەستێ
هەی دێ  هەی دێ
دێ بە دێ دێ
بە خواستی ئەو
ئەو حەلە لاقی بەیداغی
یەک پەرستی
لە کوردستاندا دەچەقێ.

*   *   *

# زەنگی نادیار

دەنگ دێتە گوێم
دەنگێ دەبیەم
ئاچۆن دەنگێ !
دەنگی بێ ڕەنگ
چەشنی گیزەی ڕەوتی هەنگێ
دەنگێ دەبیەم
دەنگی بێ دەنگ !
لەسێ یەکی شەوە زەنگێ
وەکو هەستی باڵی شمقاڕ
شێوەی پشوی کونی شمشاڵ
وشەی شنە
سرپەی گەڵای کەزی دارو چرکە چرکی دڵی زنە
ڕەنوی بەفر
شڵپەی کانی
فرمێسکی شادیی ناو چاوی شوشە عەتر
لەکۆتایی پاشکۆی شەوگار دەنگێ دەبیەم
دەنگێکی ئەهوەن و نەرم
بێ وەی تاقە کەسێ بدیەم
بەئەسپایی لۆکەی وڕیی فڕێ دەدات لە هەردوو گوێم
خوڕەی ڕووبار
کرمەی کاوێژی ئاسک و
ترپەی پانیەی پاتەی ڕێبوار

تکەی ئاونگ
شکانی چڵ
فڕەی بولبلێکە بۆ گوڵ
لە شەبەقی هەوەڵی شەو سەدایەك گوێی قولاغ کردم
چاوی ڕووحی دزیم لە خەو
چۆڵی کرد جێم
بە ڕێگای نەزانی دوو پێم
شنەی شەرمن قامکی شاشی بە هێواشی
دەدات لە پەردەی تاقی گوێم
وێڕای شەماڵ
دینگەی بێشکە و تەقەی تەبەق
کریەی قەشکێن ،دڵۆپی ساپ
تەپەی بانگوش، ئاوازێکی هزر ڕفێن
گمەی کۆتر
فجووی کەوو
تکە تکی چاوی شلێر....
ورتەی ڕاز و
خوشەی گوان و
زرینگەی زەنگوڵی کاتژمێر ...

لە دەمی تێپەڕینی دواین پەڕی باڵی شەوێ
لەو پێچەی قوتاری بوو دڵی زیندووم
دڵی زیندووی نیوە مردووم
لە دەریای مێردەزمەی خەوێ
دەنگێک نەرمەی گوێچکەی گرتم

به ئەسپایی سەرینی زل پەتووی سەر جەستەی لابردم
دەنگێک وەکو نرکەی ژانێ
وەک فووی کڵێ
هانکەی ماندوو
وەک ورتە و خشپەی سمانی کاتی رێی شەوێنی رانێ

لەو دەمەی کە سارد بۆوە دەرزی هەوتی بەنجی خەوێ
لەو شەوەی تەختی خێوی خۆشەویستیم چاوەڕوانە
چاوی بە دیمم بکەوێ
هەر لەو کژە
ئا لەو ساتە
لەو سەعاتە ماتە بێ خواس و پێ خواسە
هەر لەو کێسە کەللە کاسە
دەنگێک لەپڕ دەنگە دەنگی دەنگی بڕیم
وەک دەسەسڕ ،
چاوی لە خەو هاتن سڕیم
وەک تەختەسڕ ،
دەنگ و ڕەنگی لەسەر تەختەی ڕەشی ژووری
لەسەر تا تەختی پێ سڕیم
هەستی دەروون
مۆخ و بۆچوون ،
لێی ڕسکا باڵ بووم بە باڵدار
تاکو دەری دەرێ فڕیم

که له دەری دەرووی دەرگا دەربوو دیدەم
چاوی خەواڵوو و پڕ خەوم هیچی نەدی
شەوە ڕەشی ئەنگوستە چاو
ڕوناکیی له چاوان بڕیم
گوڕێکی برد ،
چاوگەی سەرم ڕوون بوونەوە
دەرکی ڕێم کرد
له تارای ڕەشی تاریکی شەوی تاردا تارمایی یەکم لێ بەدی کرد
وردە وردە تا پێی دەچوو
له چارشێوەی شەوی ڕەشپۆش
دەنگ و ڕەنگی بە بێ دەنگی دەرباز دەبوو
لێم نزیک بوو
که تێی فکریم پیرێکی هەناسە سواری غەوارە بوو
ئاوارە بوو
ساوالکێکی له مێزان و
توێشوولێک و
منداڵێکی له سەر مل بوو

که پورێم دیت
خلَتاینی بەرگی بە ئاو و
خرەی سینەی بە ڕێ برینی پڕ تاو
ئەژنۆی ماندوو
لەپی سڕ و
نرکە و ناڵە و
ڕوومەتی تێکدا قۆپاو

گورج بانگم کرد
لێک لێک بەڵام لە بری وەڵام
لەلای ئەو شەپۆلی شین بوو
بیابان و لە خۆ چوون بوو
ڕاقەنین بوو
مەرگی ژین بوو
نوستنێکی ناو شڵتاوی بەبێ ڕاخەر و سەرین بوو
منداڵەکان غلۆر بوونە ناو قوڕاوو
ئەمجار لەم لاو لەو لای پورێی لاکی بێگیان خڕبوونەوە
منداڵەکان قیوڕ مابوون
ڕەق دامابوون
لەسەر تەرمی داپیرەیان هەردووک بە جووت
وەکو دوو بێچوە چۆلەکەی لاواز و ڕووت ، هەڵکورمابوون
منداڵەکان دڵ پڕ غوربەت
چاو پڕ گریان
ڕەنگ زەرد ڕەنگ زەرد
لە داپیرەیان ڕامابوون
پێشنیاریان
قسەی زاریان
دایە و بابە و نەنە گیان و
قومێک ئاو و
لەتێک نان و
هەنیسکی دەمی گریان بوو
دڵیان چۆڵ بوو
وەک دەوری من

دەوریان شەو بوو
وەک دڵی من
دەوریان  شەوی شینی بێ شەم وەک دەروونم
گەمارۆ بوو بە غەم و تەم

چیتان بۆ بڵێم کوڕ گەلینە ؟
شەوی گۆڕین ، شەوی غەم بوو
کوڕی نەبەز
لاوی جوامێر لەم شەوەدا
وێنەی گەلێک گەلێک کەم بوو
کۆچی جلی ڕەنگاو ڕەنگ و کڵاشی پەڕۆ و
خۆشمە و قاقای پێکەنین بوو
کەسانی ژیر
خەڵکی ورد بیر لەم شەوەدا
لێی حاڵی بوون
پیلانی دز
کۆدەتای تاریکی چاو بز
لە تیشکی چرای زێڕین بوو

نەک سرتەی بزە و پێکەنین
دەنگی شەپ و شۆڕ و شین بوو
نەک دڵۆپەی گەردنی ماهی
گرمەی تانک و
زرمەی بۆمبای بێ بەزەیی و دڵ بە قین بوو
نەک نەغمەی گەرووی کوکوختی و سروەی شەماڵ

نەک خوێندنی مراوی و قوریتگ و قازی بەهار
لە بری گڕ و گاڵی منالْ ،
هاڕژنی تۆپ
قرمەی قومبەلەی بێ دین و
رینگە و بۆن و تۆزی خەردەلی لە عین بوو
شەوی پڕ سۆز
شەوی خۆشی و سەرەخۆشی و سەرەی سەرخۆش
شەوێک دڵی خاوەن دڵان بێنێتە جۆش
شەوی خەرمانی شۆڕشی گڕتێبەربوو ، بێ سەمەرە و
پەرت و ئاڵۆز
شەوی هەژدەی ڕەمەزان بوو
بیست و چواری سێ ی نەوەت و یەک
کاتژمێر دوو
لەپاش بومەلەرزەی کێڵگە و
تەقینەوەی (سەروچاوە) و
بزوتنەوەی ئاوی (قولە و کوێرەکانی) و
نەعرەتی کەژی (حاجیلە) و
تووڕبوونی (کێوەڕەش) بوو
وەکو خەوێکی پڕ خەم و وێنەی خەمێکی بێ خەو بوو
وەکو ژەمێک
ژینی شەمێک
ڕەنگی تەمەنی پەمەیی تەمێک بوو
کەمێک بوو ڕۆی
هەروەک خەو بوو
کرمی ناوخۆ و ماری دوژمن لەم شەوەشدا وەک ڕابردوو

دەستیان لە ملی یەکتربوو
شەوی مەرگ و مەرگی پوریٚ و مەرگەساتی نەوەت و یەك
مەرەگەی ورگی مەنات بوو
زۆر بەناو کاوەی ئەم شەوە
وەك (جاش برایم)
وەکو کۆڵوانەی کوڵمە سوور
شاگردی وەستا زوحاك بوو
زۆر تفەنگی ئاڵقە لە گویٚ لەم شەوەدا
کڕنووشیان بۆ ترس دەبرد
لێکدا لێکدا
قۆڵ و لاڕوومەتی ساتۆریان ماچ دەکرد
زۆر قین و مین و ئارپیجی
ئەقڵ تور و خانەخاپوور و کلك سوور
بنکەی تەمەن پەنجاو چوار ساڵ
شەوی بیست و پێنجی سیٚ بوو لە کانگای شۆڕش و هەوێن
جەرگەی بیتوێن
چەنگی ترس بینی گرتن
زۆر بیٚ دەمار
هەموو بە ڕیز تێیدا مردن
بەردی مەتەرێزیان کێل و سەنگەریان کردن بە قەبر

دەستەی مارە کراو وخواجە بۆ مەبەستیان
بۆ پڕی هەناوی پەستیان
گڕی گەلیٚ مەرگەمووش و
زۆر ژەهریان

چێشت به قوڕگی زامی گرانی ئەم خاکە
ئەم نیشتیمانە غەمناکە
نەک هەر نۆرێک ،
بەدەیان جار
نەک برینی سینگی دێیەک
کوێر کردنی چاوی جۆیەک
خنکاندن و سەربڕینی گوێز و مازووی جەنگەڵانی
بناری کۆیەک
بەسەدا شار
بە تەڵەکەی مشوور و چار
بیانگەی ئەوان
نەخشەی گزی و چاو بەستێ بوو
سیاسەتی وان
گوێرەکە بوو
گوێرەکەی گێل
فرچکی بە گوانی بەرازی ئیمپریالیزم گرتبوو

بەچکە پیتۆڵ زانی ناو خۆ
تازە تازە چاوەڕوانن
بەرەو ئاسۆک
بەرەو ئاسۆی دەم کەلێکی ڕەش و نەزۆک
هەژارانە
چاوەڕوانن
دەست لەسەر چاو
بۆ کۆتری قەپلاغ دار و پەڕ لە پێی سپی دەڕوانن

چاوەڕوانن بۆ هەرس و چار
پشت لە ڕوونی و روخسار لە تار
دەست بە کاریش بۆ بەری ژار
بۆ دەرمانی بن زمانی مار
بۆ پیتی بژار
بۆ گورگە و گیاکەڵە و کرمی دەماری دار
دیارە نووستوون
بە دەرزیی چار بێ ئاگا بوون
داخی گرانم نەتانزانی
لە شیردان و گوانی ڕاستیتان نەبانی
نەتان زانی
بە فەرمانی پێچکی کورسی و
هەگبەی دۆلار
چاوی کوڕی حەقیان گرت و
پەلیان پێچاو چاویان بەستوو
بە ئاشکرا و بە زیندوویی لاشەی پاکیان لەت و پەت کرد
زمانی هیچ زمانداریکی
کوردی و عەرەبی پێ پەتی
لە ئاقاری چۆرتەی نەکرد
بێ دەمارگیریی سەرنج دەین
ئەوسا کەینێ
بەبێ گرفت
هەر هەمووومان لەو دیوی پەردەی ڕەش دەگەین
تەماشا کەین
لە شەستەکان

هەتا زینهار
تاکو کارەساتی ئەمساڵ
تیمار و نەخۆشخانەی وڵاتی مە
دکتۆر و دەرمانی گرانی
برین پێچ و غەمخۆر و ئێشک گرانی
دنیاویست و
هەلپەرست و خولام کار و درووست کراون
دەرمانخانەی پێشووی خاکی خۆشەویستمان
ماک و داکی سەرچاوەکەی
وەکو ئێستا
بە ناو ڕەند بوو
پڕلە پەند ودەوڵەمەند بوو
وێنەی هەتوانی سەرەتانی حەفتا و حەوت
یا شوومی شرۆبی هەشتا و سێ
ناوە ناوە تاکو ئێستێ
کورد گەلینە
زامی پشتی شۆڕشی کورد
بۆ چەندین ساڵ
تیراوەیە و لەبری تیمار
لە جیاتی شیفا و حەلل و چار
شەتەک شەتەک
دەرمانی کوشندەی مەرگی لێ بۆتە بار

گەلی هۆشمەندی بڕوا ڕەند
دوندی سەرقەند

دارستانی پڕ سەمەرەی زۆر و زەبەند
باغی ڕەزی
ساغری دز
دەشتی پەزی
خۆراکی پەست
خۆت نەدیوە چۆن و چەندی
پڵیشاوی کەندی زام و بڕوێشی دەستاڕی زوڵمی
بەندەی پێ بەندی بەدەنی
پەندی بەندی بەندیخانەی
لبادی خەوو
بادەی شەوو
تاکەی بەردی؟
تاکەی پەرتی؟
بەو پێوەندە تۆ ئەو پەندەی
بەندەی بەدترینی بەندەی

گەلی ئەنجنی ڕێ لێ ون
گۆشتی بەرخ و
پارووی چەوری ماری ناو خۆ و
کەڵپ و قوڕگی عەزیای دوژمن
لە بیرمان بێت
سەد مردنە و هەزار فەهێت
دەردە ئەگەر لە یادمان چێت
خوێنی سێ بەندەی اسوورە دیا و
کۆی (کونە کۆترا و

خەنجەری تیرمەقەی (هەکار)
پۆپوی قرانی (هەشتا و هەشت) و
دێی (ناو دەشت) و
ژانی تەشەنای (هەشتا و چوار)

هەزار مەخابن کوردستان
دەزانم کوێت موبتەلایە و کامە ئەندامەت زامدارە
تێدەگەم سەری سەربڕت ئیروو دەژی و
جێگای سەرینی خۆشحاڵە
لاشەت کون کون
دەست و پەلت پەرستارە و حەمباڵی کۆڵی بێ گارە
هەردوو لاقی ڕەشت و ڕووتیش بە حاڵ ماون
بە شەو و ڕۆژ
جێی ژووری پاتەی بەتاڵە
لە ئاوێنەی دڵی گشت کوردێکی نەبەرد
ڕوون ڕوون دیارە
وەکو بنی کارێزی ڕوون
شین شین دەچێت
وەکو پێستی زگی دەریا و
قەفی پرچی ملی قەزوان
ئاشکرایە
وەکو دەم و چاوی ئاسمان
کێ بە ڕەنگ ئەمڕۆکە یارە و
بە ناو ئاخن
خشپە خشپە

دوژمنێکی وەکو مارە!
کوڕی فامداری دڵ بێدار
باری پشت و ڕووی دیارە!
تێڕوانینی لەگەڵ حەزی جرج و کیسەڵ
ئاوە ژووە
ڕووی لە ڕووگەی نیسك و تۆم و گوێچکە نان و زرینگەی دراو و
خشخشەی دینار نەکردووە
نەوەی کوردی ئاکار لەبار
لە (حەفتاو سێ) تەنها یەکێ بە بێ مردن نەمردووە
تەنها یەکێ لە (حەفتا و سێ)
لە گوێی گا جووت
بەبێ نووستن پرخە پرخە نەخەوتووە !

وەچەی سادە
گەنجی ناو گەنجینەی بەتاڵ
درەختی دڕکی بێ سێبەر
خوێنکاری لە عەقڵ بێزار
چەکی من و
قەڵەمی تۆ و
گشت داماوانی ئەم خاکە پڕ ئازارە
ئاگادارین
هەتا هەین و
تاکو یەکجاری لێی دەنوین و ڕا دەبین
پشت بەکۆڵ و
زنجیر بە قۆڵ و

مل بە کەمەندی پرسیارین
بێ سێ و دوو
ئاگادارین
کوردستانی کچی خوێن و
دایکی زیندان و سێدارە
نیشتیمانی مەڵبەندی ژان و لە خۆدان
سەبایە و کیمیا و قەنارە
ژینە ژانە و دەغەزدارە
لاکەنەوە
بە چاوی ڕاست وردبنەوە
بەژنی وڵات
لە ترۆپکەوە تا بەری پێ
بە چەند خەنجەری ژەهراوی چەلی ناوخۆ
لیبرالیستی خۆرئاوایی
برینداره
چاک بەڵەدن
لە خۆم زیاتر
ئەم نیشتیمانە بێ شوانە
ئەم دوندانە خاك بەسەر و سەرگەردانە !
فێرخوازێکە بێ فێرکار و
جەسوورێکە بێ دەستوور و
ناساغێکە بێ چاو ساغ و بێ سۆراغ و بێ دەرمانە !

کورد گەلینە ،
چاوی ترس هەڵبگرن و

هەتاكو كەی
چەكی خۆ كوژ دابگرن و
هەر هیچ نەبێ
وەك مرۆڤێك ،
بە پەنجەی دڵ گوێ ڕابگرن
نیشتیمانی پچڕ پچڕی لە نەخشەی جیهانی كڕاو ،
جەستەی وڵاتی دابەشراو ،
ئاڵای كوردستانی دزراو ،
لە گەرمەی دەرد و قەیرانی
بەكتریای شۆڕشی خریدی و
ماشقەی ئاشقەی خریدار و
هەراسانی چنگی هەرسی كار بەدەستانی ناكامە
هانا بێنن
ترکزەیە و زۆر جێی ترسە
شەپرزەیە و
كۆتا هەلە و
لە حاڵی تاڵی مەپرسە
گێژاوە تای وەك پشكۆیە
كەفتە كارە و
پێی لەسەر زاری گڵكۆیە و
بێ ئامانە
ژانی دڵی
بەرد و گڵی
وێنەی دەروونی زۆر هانی
بەسە زمانە

کورد لە کێڵگەی کوردستاندا
بۆتە دەغڵێکی دەغەڵ و گەنمێکی ڕەش و پووچەڵ و
دەمی مڵە و
لاقی سنە و
کوێرو و تیرەبڕەی میوانە.

*　*　*

# سۆزی وڵات

ئەی خاکەکەم ،
هاوژینی ناخی داخی من
ئەتۆی شەمی غەمی تاری منی بەنی
منی زیندانی زیندەگی
پەسارگاکەم
دووچاوی مەلی بژوێنیم تادیمی ئاسۆ دیبکات
نابێتە خاڵ بەڕووخساری
رەقی زەویی
عەیانە لێم بە حەزی وی
دەگات بەسارداوی هەواری نەمریت
پێشمەرگەی تینوی ئاوی رێت!

ئەی خاکەکەم ،
حەوانەوەم لەژێر نسێ ی حەوای پاکی
خاکت نەبێت
رەنگی (حەوا) ی دەرکراو و
بێ بەهەشتە
وێنەی ژیانێکی پڕ ژانی نیوە گیانی
بەبێ هەست و نەست و خوستە

پەسارگاکەم ،

خوێن چۆن لەدەلاقەی سنگما

لەهاتووچۆ

چرکەیەکیش دوا ناکەوێ

چۆن چاوانم بەبێ کلچوی یادی خوماری

ناخەوێ

یا چەندە

باسکی ژیان و هەناسەم

ئەستۆی ئازادی خۆش دەوێ

یا چۆن خڕۆکەی ڕوو سپی

لەسەنگەری برینەکان

لە پێناوی گۆشتە زوونەی کەوڵی وڵاتی لەشەکەی

لە یەکێک لە سەنگەرەکان

بەشەهیدی لێی دەکەوێ

نەک ئەوەندە،

چەند زەخم و ناسۆری زۆری کرمە ڕێزی

کوردی داماو

دەرمانی قورئانی دەوێ

ڕەنگە زۆرتر تۆم مەبەست بێ و

نیگای ڕابوو

خەو لێ زڕاو ڕاماوە لە نومایان و

چاوەڕوانی گزنگی ڕۆژە

دەرکەوێ

ئەی خاکەکەم ،
چلۆن (شنرویۆ)[1]ی سەربەرز
(هەڵەبجەی) دایکی هەوارامانی خۆش دەوێ

وەکو نەسیمی دێی (پریس)[2]
بە ڕووی (عاشقان)[3] و (قوڵکە)[4] دا
دێ و دەکەوێ
یا (جەلیلە) و دێکەی (عەنەب)[5]
لە عانی ئاویلکە دانا
لە دوا نەفەسی ژیانا تەنها جارێک
چاوی لێڵیان
وێک دەکەوێ
ئەی تەرمی هەڵەبجەی شەهید
شێوەی نوستوو
لە ئامێزی چیای نووەر...
لەسەر گابەردێکی شەهید
لێی دەخەوێ...

دڵنیا بە ستارگاکەم ،
ئەی ئاڵاکەم ،

---

(١) کێوێکە لە پشتی هەڵەبجە.
(١) گوندێکە لە نزیك هەڵەبجە.
(٢) مەبەست (کانی عاشقان)ە کە گەڕەکێکی هەڵبجەیە.
(٣) مەبەست گەڕەکی (کانی قولکە)ی هەڵەبجەیە.
(٤) (عەنەب) گوندێکە لە پەنا هەڵبجەیە.
(٥) سەرچاوەیەکی زولاڵە لە پشتی (ئەحمەدئاوا )ی هەورامان.

ئەی کاڵای سووری باڵاکەم
دڵنیا بە
هەروەکو (زەڵم)[1] هەتا ئێستا دەم و لێوی پاراوە

یا (شاهۆ) و کێوی (باڵامبۆ)[2]
بەردەوامن
سەری کەشیان نە نەواوە
دڵنیا بە ئەی خاکەکەم ،
سەر هەڵبڕە ئەشکت بسڕە
بەرگی پرسە لەبەر بدڕە
هەوری ڕەشی نا هومێدیی لەسەر ڕوخساری خۆر ببڕە
بێچوە هەڵۆی (شێخ سەعید) و
(سەلاحەددین)
چاوی گەشیان لە ژێر لا باڵی
دەرناوە
ڕۆژێک دەبیەن
نەک تەنها تۆڵەی خوێنی تۆ
بەشکو ملی هەزاری وەکو ( ڕیچشارد)[3] یش
لە ژێر لاقیدا چاوەڕێی
میهرەبانیی
کەڵە پیاوە

* * *

---

(١) (باڵامبۆ) چیایەکە لە شارەزوور.
(٢) سەرکردەی سوپای خاچ پەرستەکان بوو لە شەڕەکانی صلاح الدینی ئەیوبیدا.

# قەڵەمی ڕاستگۆ

١٩٩١

چەند خودکارێکی ڕەنگاوڕەنگ
خڕ بوونەوە لە پەرداخێک
بە شێوە و ڕەنگ
سەرزارەکی بۆ کردارێک
بوون بە یەک دەنگ
بەڵام پێنووسێکی خۆشنووسی سپی نووس
نەخاپا و هەڵنەزەلی
بە وێنەی (حەمرین)
بوو بە (قەندیل)
نەک هەر قەندیلی بە مەندیل
بوو بە (سورێن)
بوو بە کێوی (ئاسنگەران)
بوو بە لوتکەی سەختی شنوور
بوو بە سنوور ، سنووری کالاّ و بەرگ سوور

دەپرسن لەو خامە ڕووخام و خاوەن فام و قامەی ،
چی یە و کێیە ، خەڵکی کوێیە؟!
پەساپۆرتی
کام ئاسمانی لە چاو ون و ،
کام ئۆقیانووسی بێ بن و ،
کام دەربەندی هەزار و یانزە ماتگ کون و ،
کامە ڕێگە و ، کێهە جێگە و ،

کامە دوورگە
سێ سەد و شەست بت و ڕووگە و ،
کام ئاوایی یە ڕەش ڕەنگ و ،
کامە دێهاتە لاپەڕگەی لە هەگبێ یە؟!
بۆیە دەڵێ :
لەسەر خۆ بە ڕاشکاوی
لە وەڵامدا
دەڵێ بەڵێ...
ئەمن قەڵەمی قامکی لقی بەڕوێکم ،
دار بەڕوێکی زۆر بەتەمەن...
تا بڵێی گەنج ...
تاکە بەڕوو ،
بەژن تاقە کەڵەگەت و
خەزان وەریو
بەڕوێکی لاخ و گەڵا کرووزاو و پەل کوتراو و
ڕەگ داکوتراو
بەڕوێکی قەد ئەستوور و
قاپ بریندار
برینداری دۆخی بیوری دەسک لەدار
کلکی زڕە دارەبەن و وەڵگی کرمێ و کەوت و سپیدار
لە باغە جوانەکەی کوێستان
کەژ و جەنگەڵی کوردستان
بەس من نەبێ تاقانە بووم
بە تاک ڕووام
تەنها ژیام

دووره پەرێز
نزیک لە خوێنی سەربەرزی و
دوور لە قەد و غیرەت نزمی!
دەنا هەموو دراوسێکانم ،
دار و درەختی جیرانم ،
بەرو گەلاّ و پەلیان فرۆشت...!
نەمامی ناو خۆ و بیانی سەر بە هەتاو ،
کە دیتیانن
دوور و نزیک کە بیستیانن
دار و باری لێرەوارمان پاکی کڕان
سەرجەم بڕان بە بار بران
بوون بە تەختەی تەخت و دەرباری پایتەخت
کە وایان بیست
هەموو لقی غەمیان کرۆشت
بەڵێ فرۆشان
بەچەند بەرچن ، بە چەند داربڕ ، بەچەند داربڕی ملهوڕی
گیرفان و کیسەباخەڵ پڕ
بۆیە من مام
بە تاقی تەنێ بە جێ مام
وەک کوڵکە زێڕینەی بەهار
بەیەک ڕەشەبا نەفەوتاوم
وەکو نزاری (گۆڕ مەریەم)[١]
بە دەمی تیغی خۆرەتاو هەڵنەپروکام

---

(١) لوتکەیەکی بڵندی شاخی(کێوەڕەش)ە کە پشدەر و بتوێن لێك دادەبڕێت و بەسەر ڕانیە و سەنگەسەردا دەڕوانێت.

وەک کانیە درۆزنەی دەربەند[1]
بۆ یەک قومە ئاو نەختکام
چونکە بەرِوێکی خواکرد بووم
شتلی ژێر تاوڵ و نایلۆن نیم
مەسلەحە نیم
دەستکرد نەبووم
شووڵەکانم بۆ باڵندەی دارستانم
نابنە سەوە و تەپکە و قەفەس
بۆ هیچ بولبول و سوورە گوڵ، نابنە سندوقی بێ نەفەس
یا وەکو دوورە حەیزەران
وێنەی بن گەندەڵە چنار
نابنە داردەستی گاوانێکی نالەبار
یا وەک ملی کوورِی گۆچان
شێوەی گەردنی کەچی گۆپاڵ
سەر شۆرِ ناکەن بۆ هیچ شوانێکی ستەمکار
بێ پەروایە، رِانی مەرِێ ، شوان کارەی گەر ورچ بێ
مێژوو رِوونە چی بەسەر دێ

گشت ئەنگوستێک ،
- وەک مانگی چواردە — دەست نی یە
دڵنیا بن ،
هەموو شێخاڵێک رِێ نی یە
دۆڵێک باس و ئاژانس هەنە
فێڵ و دەمامکی دزینە

---

(١) کانیاوێکە لە دەربەندی نێوان رِانیە و سەنگەسەر بە دیوی بیتوێندا.

تەنێک ئەنتێن
(تی . ئێن . تی)ی قەڵای مەردایەتین
گەلێک قدولکە و فتیلە ، یا پەڵوختە و چرا ڕەشکە
چرە دوکەڵیان ، سیانوری بیر و بین و بیناییبنە
خەردەلی ئاکاری جوان و نەتەوەیی و
لوتکەی هەرە بەرزی دینە
بەکرێ گیراون ئەوانەی
دەڵێن پرشنگی خۆر و زەوی تاریک دەبێ جیا بێ
دنیا پەرستن ئەوانەی
دەڵێن ئامانجی جیهانمان ، فەلسەفەی بوون و ژیانمان
تەنها خاک و بەرد و گیا بێ
کەودەنن ،
گوارەی گوێی ئەهریمەنن ، هەموو ئەوانەی
دەڵێن زەویی ئازادیی ، کێڵگەی ژینی شادی و کاتی
مەگەر بەس لە دونیا زابێ ...!!

چواردە سەدە تێپەڕیوە ،
ڕەگی بەڕووی بڕوادارم
داچەقیوە و لاق چەقیوە ، لە قەمچیی پانیەی زۆزانیٚ
بە کزەی بای لەبای شەو بای
ساوی هەساوی (ساوێن)یٚ
چاوی چرۆی خوا پێداوی نەترساوم هەڵهێناون
لە کوردستان
ئەوەتی هەم
لەوەتی لە زەوی بوو وم

هەتاوم لە ئامێز گرتووە و
بووم بە دوژمنی تاریکی
لەوەتی بووم
ئەوەتی هەم
هیچ جار نەمکرد
دەستی تەوقەی موتوربە
بخەمە ناو لەپی لقی هیچ دار ژەهرێ ،
هیچ خائینێ ،
کە تەیرێکی بێ باڵ کردبێ
هێلکە کۆترێکی گلاندبێ
هەنگێک  یاخود زەرنەقوتێکی مراندبێ
لەوەتی لە دایک بووم ، هیچ گا نەبوو
دەنکی بەڕووم ئەوەندە گێژ و خۆ پێ کەم و وەزن کەم بێت
دەمی قەسپێکی قسە شیرن و
ناوک ژەهر پێوە ماچ کات
تا بشمێنم ،
دڵنیا بن ،
سەری کەڵم ، چاوی پەلم
بۆ هیچ داڵی کەلاک خۆر و هیچ سیسارکێک
نەوی ناکەم
جەوهەری قەد و لق و پۆم
بۆ وەیشوومەی خوار و ژووری شەرق و غەرب کەوی ناکەم

لێو عەیان بێت خۆشەویستان
نووکی قەڵەمی چاو تیژم

بێ بەرییە لە درێشووکە قەڵەمی مار

لە نووکی دانی خەمگرۆ و

بەناو نووکی دەنووکی کۆتری سپی و ئاشتی هێنەر ،

لە ناوکاردا تەزووی زێڕ و

پاندانە دەنووکی داڵ و زمانی کەومار

زۆر پاندان و قەڵەم ستێنسڵ ئەمرۆ هەر بۆ ناو نووسەرن!

زۆر قەڵەمیان ،

وزە و مەرەکەبیان خوێنی سووری گەلن!

گەلێ جاف و پاندان و دار ،

شوژنی چاوی ڕۆشنبیرین!

گەلێ ماجیک گەلێ پارکەر ،

دەرزیی بەنجی بیر تاریکین بۆ لاوان و

بۆ چینی نەزان و بێ کار بوونە نەقیزە و قوڵە دار!

گەلێ جاف و پاندان و دار !

پەڕی سیخوڕ و،

کەڵپی ڕێوی و،

پەڕە موچی بایە قوشن!

گەلێ جاف و پاندان و دار!

چەکوچ و قەڵەمی زۆردار و بزماری لەپی هەژارن!

گەلێ جاف و پاندان و دار!

شێوەی (بلفۆڕ)[1] وەکو پەیمانەکەی (لۆزان)[2]

---

(١) وەزیری دەرەوەی بەریتانیا لە کاتی جەنگی دووەمی جیهانیدا ، لە ساڵی ١٩١٧ بەڵێنی بە جولەکەکاندا دەوڵەتێکیان لە فەلەستین بۆ دروست بکات.

(٢) ساڵی ١٩٢٣ لە فەرەنسا ئیمزا کرا دوای کودەتای ئەتاتورک ، کە تیایدا هەموو ئەو بڕیارانەی لە پەیمانی سیڤەر درابوون لە بەرژەوەندی کورد هەڵوەشانەوە.

کۆنفرانسی خەرتەلی بیست و سێ وڵاتی
لغاو بەخوێنی کوتی لاشەی ئەمڕۆی کوردن!

خۆشەویستان ،
نووکی قەڵەمی ناوبراو،سپی ڕەنگە
وەکو پەڕی سینەی پەڕاو ،
ڕەنگی تاڤگە ،
وەك قەڵبەزەو شەپۆلی ئاو،
وەکو تروسکەی چاوی برووسکە،
وەك خەزێنەی سەر هەڵگیراو،
وەکو بەفری لوتکەی(کوڕیس)[1] ی بەرهەتاو
یاوەك دڵی خاوێنی کوردی خەڵەتاو
ڕامێنن لێم ،
نەك لە ڕەنگم بەڵکو لە ڕێم !
پاکی تاکی ماخۆی خاکی خۆشەویستم
وای فەرموو پێم:
لەکاتی شێنەیی،هێدی دڵ پڕ ئارام،
قەڵەم وەك دەنوکی هومام!
لەعانی ڕەواو تورەیی ،
بێچوە هەڵۆ ،
بەچکە پڵینگ ،
یا پەڕکوری شەیدام
وەکو شالوورو کەناری
یا فندی گزگلی بزێو ساویلکە نیم

(١) بەرزترین لوتکە شاخی چیای ئاسۆسە.

لەبەردەم و لە سەر پشتی گاو بەرازا هەڵبنیشم،
بە چەنگانم،
تۆزی ملی لا هۆملی
بتی بتەکێنم!
بەدەنووکم
کرمۆزی گوێی بفرێنم!
بەماکانەی ماسی و جورەش خۆم نافرۆشم
بۆکرمی قولاپی زاڵم
یان بۆ گەنمی دەمی تەڵەی نابەکارم نابمە نێچیر!

خۆشەویستان،
وەکو سوێروو بۆ کلێنجی قووچ ،
یا سمۆرە بۆ گوێزی پووچ
هەڵنا فریوێم!
سروشت قەلی و ڕەنگ گاگەلین
بێ ئەندازە بەدی کردوون
کە هەوێنی هەڵسوڕانیان ،
دینەمۆی ڕەوت و جوڵانیان،
پەڕۆن،
یان گوتەی زەرق و برقی چۆوە
ئەی هەڵەتانج ؟!
یانە پۆڕو فرووجە کێوی
چاوقایمن،
جارو بارە ڕاوی جرج و کتکێ دەنێن
بەڵام لە قووت دانی هێلکەو لە دۆڕانێ

لە پیس کردن و لە شکانێ
درێغی ناکەن

وەک پێم وتن،
توربێنی شیعرم بۆ ڕشتن
من شیعری نوسراوەی نووکی
ئەو قەڵەم دارە بێدارە بڕوادارە
وەفادارەم
بۆو ڕێبازە
ئەو کوردە کورتە ڕێبوارەم
باوکی بەڕووم
قەدو باڵای لەکوردستانی پڕئازاردا ڕواوە و
دەمارو ڕەی
بەسروشی بەدیهێنەر گۆشکراوە و
کڕۆک و ڕەگی
بەعومری خۆی بەزۆنگاوی عەلمانیەت و
بە چڵکاوی خۆ فرۆشی
ئاو نەدراوە...!!

* * *

## با بەناو و ناوك يەك بين

با هەر هەموومان
ناوێک بین
پێناوێک و
مێژووی بەرزی پەڕاوێکین
هەر یەکمان
یەک قومە ئاو بین
شەپۆل و تین و تەوژمی
لافاوێکین
هەر کەسەمان
یەک شەمچە دابگیر سێنێت
ئەوساکەینێ
شەوق و تیشکی هەتاوێکین
با هەر کاممان
خونچەیەک بێت
لەو کژەدا بەبێ گوڵزاری نەوبەهار
بەبێ پەنجەی نەرمی شەماڵ
بەهارێکین
دەکەوا بوو
تاکەی یەک یەک دوور بین لە یەک؟!
ڕامێنن لە هەموو ڕێیەک
یەک یەک بەڵام

یەکیان ڕێ یە..!
یەکیان ئاوی سازگاری
گڕی دەروونی مەی پێ یە..!
نەک هەموو یەک
دەبا هەموو
هەروەکو یەک
دڵمان گوێ ڕایەڵی دەنگی یەک ڕێگا بێت
تاقە ڕێ یەک
لەم ڕۆژەدا
یەک سەر و دەست و یەک هەست و،
یەک هەڵوێست و،
بە یەکەوە یەکە یەکەی دوژمن یەک یەک
دەتۆپێنین
یەکانەی مەرگ بەیەک تەکان
دەتۆقێنین
یەک بەیداغ و یەک پەرستن...!
یەک سەرکردە و
یەک گەیاندن...!
بە یەک هێرش،
یەک لە دوای یەکە
سەرکەوتن
لە سەد دونیاش یەک جار مردن...!

* * *

## لیّتان پرسیوین ئیّوه چین ؟! ئەوەش وەڵام

لوتکەی قەندیل،
گەوەی ماکۆک،
پیّدەشت و بناری حەمرینین...
برنەوەکەی شیّخ مەحموود و
شمشیّری سەلاّحەددینین...

کڵپەی باوەڕ،
گڕی کەرکووک،
ناڵەی پیری بادینانین...
پەنجەی زارۆڵی هەڵەبجە و
کفنی ئاڵی شەهیدانین..

دەنگی قورئان
چەکی خەبات،
کیّوی کۆڕێ و بالیسانین..
بەرگ و نانی هەژاران و
خاک و خۆڵی کوردستانین

تینووی ئیسلام،
سایەی دەوڵەت،
سەدای چەوساوەی جیهانین..
نەخشەی یەکگرتنی کورد و
هەر پیّنج پارچەی کوردستانین

* * *

# مانگ گیران

سەرەتای مانگی(٢) ١٩٩٣

نیوه شەوە،
نیوه شەوە و دونیا کپە
جیهانی مادده ئێستاکە
لە پشتێنی بەرەژێر
هەمووی مردووە
شەوەو زەویی
جل و بەرگی سەرەخۆشی
بە بەدەنی دا کردووە
چونکە ڕۆژی نازەنینی بۆ چەتکاتێک
ڕۆشت و وەفاتی کردووە
شەوە و خەوتن،
لە ڕوخسارت
لە دونیای بوون و نە بووندا بوونی نی یە و
بەر لەوەی ببێت ،
مردووە...

شەوە و ،
هەموو تیۆرێک
چەنگی وەک ڕەنگی ڕەشی تۆیە
بەس سیستەمێکە زیندووە و
کافوور ڕەنگە و

له ڕووحی ڕووناکی
بووه...

ئێستا شەوە و
لەو بازارە ڕەش و برشەی
بەس پاتاڵی رەش دەفرۆشن
وریا نەبی،
پڕ بە خوستان
پڕ بە کەللەی ڕەشی جیهان
جلی ئاوریشمی زێڕ کفت و
کووتاڵی زیویت
لێ دەکڕن
ئێستاکە زۆر بازووی ماندوو،
تیغی تیژی مێشکی زیندوو،
ئاستی ژینیان،
پڕخەی هەوا هەڵمژینیان،
له تڵپەی بنی
خەوتنه...
ئێستاکە خەنجەری بریقەداری
زۆر کوردی
بە توانا،
هەڵکێشانی
بە دەستی گلاوی دوژمنه...
ئێستاکە
زۆر پێشمەرگە هەن

له بەر تاریکی ی شەوە زەنگ
چەکی دەستیان
قۆنداغی بەرە و دوژمنە
زۆر ئەمیندار ئێستاکەش
هەر ئەمنی سوورن
زۆر ئیستیسلامی ی خێرۆمەند
نۆکەری پارەی ئەستوورن
زۆر یەکگرتن، یەعنی: کورد ئیبادە کردن
زۆر یەکڕیزی، ئەمرۆ یەکتر سەر بڕینە...!
زۆر نزیکی ئێستا یەکتر هەڵبڕینە
زۆر یارمەتی ، یەعنی: ڕۆژ ڕەشی و نەگبەتی...!
زۆر قۆڵ لێکدان ،
قۆڵبڕینە...
زۆر تێکەڵاویی و تێک چڕژان ،
شەڕە قۆچ و تێک هەڵدانە..!
گەلێک جاران، پێکەنینی سەر لێوی
تەنکی ئازادیی
کوڵی گریانی زیندانە و،
ئەنجامەکەی قوڕ پێوانە...
ئەی بەرە و کوێ شاتمان بێنین..!
بەرە و یەک خوا..!
ئەی لە گەڵ کێ یەکتر بگرین..؟
با هەموو یەک ڕێگە بگرین..
یەکتر گرتن مسۆگەرە
ئەو قسە جوانانە هی کێن؟

ئەوە خواوەند فەرموویەتی..
ئەوسا سەد و چوار وڵات و
تەنها یەک گڵ
سێوەکی پێنج پارچە و یەک چڵ
کوانوویەک و تەنها یەک کڵ
یەک ملیار بەدمن و یەک دڵ

ساتێک شەو
ڕۆژ دادەهێنێ..
چۆڕێک ماست
شیر دەمەیێنێ..
لوێچێک خوێن
حەق وەدی دێنێ..
بایەکی توند،
بای بە توانا،
خەو
دەزرێنێ و ،
شەو
دەمرێنێ و،
قوڕ باران و تەم و مژ و گێژەڵوکان
دەڕەتێنێ و،
مانگی گیراو،
مانگی کۆت و زنجیر کراو،
لە گەدەی چەوری ئەژدیهای هەوری دڵ ڕەش
دەر دەهێنێ

زۆر وڵاتی پەرێشانی،

پڕ شەوە ڕەش و تومانی،

وەک کوردستان،

بە خوێن

دا دەگیرسێنێ..

شەو درەنگە..

شەو درەنگە و،

ڕۆژ لە تەمێ دا گیر بووە

مانگی قوتابی ی

قوتابخانەی خۆر

تووشی هەورێکی تیر بووە ،

لە نۆسەد و بیست تا ئێستا

دەست بەسەرە و،

لە مزگەوتانی ( ضرار) [1]

گۆشە گیر بووە..

شەو درەنگە

خەو سوڵتانە

خەون

ئێستاکە گاوانی گاڕانی سەرکردەکانە

خەیاڵ ئێستاکە لۆ قنتەی دیوەخان و تەکیەکانە

شەو درەنگە و

ئێستاکە مفتە خۆرەکان

(١) مزگەوتێک بوو ، کاتی خۆی موونافیقەکانی مەدینە بە نیازی فڕو فێڵ و تەون بەستنی نهێنی درووستیان کرد.

سوڵتانە ورگ تێرەکان

لە دەریای خەوتن

خنکاون

کێ دەڵێ ئێستا

کانیاوی خانوە گڵە ڕووخاوەکان

وەک تەنوور دانەگیرساون..؟!

کێ دەڵێ ئێستا

تەنوور و ئاگردانی

ماڵە قوڕە هەژارەکان

وەک گۆماو دانەوەستاون..؟!

کێ دەڵێ گوند و پەرستگای

هەشتاکانمان

بە دەستی زرکوڕەکانی

باوکی (قوصە)ی وەک مزگەوتەکانی کەلار

بە ئاربیجی نە ڕووخاون..؟!

کێ دەڵێ

چوار هەزار و حەوسەد و سی و یەک ئاوایی

بۆ شەهیدانی (دۆڵە ڕووت)[1]

نە سووتاون..؟!

بەم شەو گارە ،

کێ دەڵێ (٦٠) هەزار

ئافرەتی کەساسی ( بۆسنە )

---

(١) ئەو پێنج پێشمەرگەیەی بزووتنەوە بوون ، کە لەشەڕێکی دەستە و یەخەدا لە ناوچەی (( دۆڵە ڕووت )) بە دەستی بەعسی یەکان لە ١٣/ ٦/ ١٩٩٠ شەهید بوون. کە بریتین لە:( هیدایەت حەمە کەریم و سلمان محمود حسین و باوەڕ عوسمان صالح و ئازاد حمە ظاهر و نصرالدین معروف) .

به مەرەدی
ئەنفالەکانی کوردستان
نەبراون..؟!
کێ دەڵێ یەک ملیۆن و نیو
ئەستێرەی
ئاسمانی ئەفغان
بۆ کۆچی ( جمیل الرحمن )[1]
نەگریاون

ئێستا شەوە و
چاو فڕووزایی نا بینێ
کێ هەیە ڕووی هەق بیینێ..؟!
کێ هەیە لە ئاستی ڕاستی
سەری نزمی دانەوێنێ؟!
بەم شەوگارە
ئێستا ڕاستیی
بە دوا شوێن پێ ی
ماکی ڕاستی سەری وێڵە...
ئێستا خواریی
وەک ماری خوار،
وەکو پێچ و پەنای ڕەشمار
لە سەر سفرەی کونی سوانەی،
ماڵە سادەکانی ولاٌت،
نان خۆرێکە و،

(١) موجاهیدێك بوو لە شاری ( کونەر ) ی ئەفغان شەهید کرا!

نان دێن درِه و،
شەو فرۆشە و هەتاو کرِ و
دژی خێره و، مەشکەی وەک مالۆسی تێره
ئاخ چاوی سپیم
ئێستاکە دووربینی گەلێک
لە چاوە رِۆشنبیرەکان،
سەرەوبنە..!
ئێستاکە دڵی زۆر دڵدار
ئەوینی راستیی لیَ ونە..!
ئێستاکە قاچی زۆر رِێبوار
دوژمنی جادەی رِۆشنە..!
کیَ هەیە
لامپای خۆش نەوێت؟!
مەگەر دز بیَ!
بەم شەوگارە
کیَ یە
غەنیمی بانگی تۆ؟!
مەگەر عەفلەقی کورد کوژ بیَ!
هیچ کێڵگەیەکی کوردستان
رِقی لە نمەی
بارانە؟!
هیچ لوتکە شاخێکی کوێستان
دژی بەفری
لە سەرانە؟!
هیچ نەمامێکی دارستان

دوژمنی خەندەی
بەیانە؟!
نەخێر قوربان!
ڕۆژ هەر ڕۆژە؟!
با شەمشەمەش پێ ی ناخۆش بێت
مەرگ و بەرزەخ و ڕەستاخێز
بە تاڵووکەن
با جەللادە کانیش ئەمڕۆ
هۆش و گۆشیان
لێ ی خامۆش و
هەناوی ڕەش و نەخۆشیان لە حەیفانا
سیا پۆش بێت..!
درەتک یا زوو،
خونچەیەکە و دەبێت بەگوڵ
هەر گوڵێکە و
دەبێت بەباخ
بەردێکە و دەبێت بە تاوێر
هەر تاوێرە و
دەبێت بە شاخ
چەوێکە و دەبێت بە خشتە
هەر خشتێکە و
دەبێت بە کۆخ دەبێت بە کۆشک
دەبێت بە دیواری
وەتاخ

## ڕێبواری نامۆ

ڕێداری تۆم ،
هەڵوەدامە و
یەکجار بێناز..!
وەکو هەنگێکی لانەواز..
تینووی گوڵاوی چاوی تۆم
چۆن ئەو ئەوینە پاکانە
بەبێ یەکتر مەدار دەکەن؟!
ئۆخژن دەگرن؟!
ماسی: بێ ئاو؟!
لێوی خامە: بەبێ ڕوومەتی دەفتەر و
گۆنای درەخت:
بەبێ هەڵمی دەمی هەتاو؟!
من ڕێبوارم
ئەتۆش ڕێگای!
من تینوومە و
ئەتۆش دەریای!
من پێشمەرگە و
ئەتۆش لوولەی چەکی برِوای!

دەرمانێکی یەکاو یەکم
نەخۆشە کێژ و هێرەکان

پشتیان لێمە!
چراێکم ،
ڕەشەبای شووم
کوڵی لەترووسکەی جێمە..!
بولبولێکم ،
قالۆجە و سیسرکە و تەپۆ
ڕقیان لە شەو نخوونیم و،
لە بۆن و بەرامەی ڕێمە...
بێدارێکی ڕاپەڕیوم،
لەناو نوێنی ڕەشی شەوداو،
تاریکستان بەرد دێنێتە سەر ڕێگام و،
قینی لە هەنگاوی پێمە...
چریکەی گەرووی خنکێنراوی
( هیوا ) و ( دکتۆر خالیس ) و ( منەووەر )[1]م
بوومەتە کەنەکی بناغەی
شۆڕشی نوێ
گرمەی تەکبیری زوڵاڵی،
کپکراوی،
( ئاری ) و (جیهاد) و ( نەوزاد )[2]م
هەر چەندە باوەشی عەموود

(١) عبد الصمد مجروم ( هیوا )، خالص محمد عمر، حاجی منەوەر.. سێ کادیری بزوتنەوەی ئیسلامی بون، ڕۆژی ١٥/ ٢/ ١٩٩٠ لە لایەن ئەمنی هەولێر گیران و ڕۆژی ٢٦/ ١٢/ ١٩٩٠ ئیعدام کران، لە گەڵ شەش برای تر ، کە بریتی بوون لە ( مامۆستا مەلا محمدی کونە فلووسە و حاجی حازم و عبد الله و ئەنوەر حدیدی و تاریق و محمد صالح ) خودا بە بەهەشتیان شاد بکات.
(٢) سێ شەهیدی بزوتنەوەی ئیسلامین، پاش زنجیرەیەك چالاکی لە ساڵی ١٩٨٩ لە لایەن ئەمنی هەولێر دەستگیر کران و لە ١٨/ ٤/ ١٩٨٩ لەسەر ڕێ ی عەنکاوە ڕەمی کران، خودا بە بەهەشتیان شاد بکات.

بمگرێت و،
پەرۆ چاوم ببەستێت و،
گوریس لە باسکم بئاڵێت
تەکبیرێکە و،
قورگی تفەنگ
دەنووسێنم..
زراوی مردن دەتۆقێنم..
پۆستاڵ ڕەش و،
سەر بەهەشی دائیرەی شەعبی ی ( عەنکاوە )[1]،
پێنج پێنج بەرە و مێزی باوەڕ
دڵیان لەخەو،
هەڵدەستێنم

هیچ جوتیارێکتان بینیوە
عاشقی قەدی گیاکەڵە بێ و
گوڵە گەنم بفەوتێنێ؟!
هیچ ڕێبواری واتان دیوە
چەنگی تاریکی ی خۆش بوێ و
ڕووناکی ی ڕۆژ ببوغزێنێ؟!
هیچ شوانی ئەوینتان دیوە
عاشقی سەگی گورگە مێش بێ و
خۆی لە مێگەل نەگەیێنێ؟!
هیچ پێشمەرگەتان بیستووە

---

(١) شارۆچکەیەکی نزیك شاری هەولێرە و زۆربەی دانیشتوانی ( فەلە ) ن، دائیرەی ( جیش الشعبی ) کەوتبووە سەر ڕێ ی نێوان عەنکاوە و هەولێر، لەوێ شەهیدان ( ئاری و جیهاد و نەوزاد ) ڕەمی کران.

چەکی دەستی ئیستعمار بێ و
ئاوایی خۆی بڕووخێنێ؟!
من ڕێبوارێکی غەریبە و
دەستی دڵم توند کردووە
لە دامێنی شەقاوی تۆ..
لەناو سەت داو،
بەس کەمەندی بەتاوی تۆ..
لەناو حەفتا و سێ درووشم و لافیتە و ناو،
بەس پەڕاوی پاراوی تۆ...!
من ڕێبوارێکی ماندووی
ماندوو نەبوومە و ،
مەلی خۆشەویستیی ڕوحیت
لە قەفەزی دەروونم دا
هەڵنیشتووە و،
جێ ی یەکجاری ی خۆش کردووە
جار جار بەدەنووکی وشتی،
پەخەی دڵم دەجووڵێنێ...
هەر کە نووستن لە پشتەوە دووچاوی گرت،
ئەمیش بەخەبەری دێنێ؟؟!

ئەوینی تۆم..
وەک ئەویندار..
وەکو گەردنی کاک (نەجم) و
باسکی تەنافی ستەمکار...
وەکو نەزەری ئاربیجی

چاوی سەنگەر،
وەک برینی دەورچۆڵی
(شەریف) ی چاڵی چاڵەوان ،
وەک (صابر بەیدەقی) ی کاکۆڵ خوێناوی ی بیمارستانی کرماشان
وەکو برینی هەتوان و،
دەروونی بەندە و قورئان و،
بەربانگ و دڵی ڕۆژوەوان...
خۆشم دەوێ ی ،
لێت جودا نیم
من مۆم و
ئەتۆش دەزوولە...!
تۆ فانۆس...!
منیش پەپوولە...!
ئەتۆ هیزر و هەست و گیانی
گیان و جەستەم برای گیانی
بەبێ تۆ دانوویان ناکوڵێ و
بە دووری تۆ
ئەوانیش لێک دەترازێن و
بۆ دواین جار
ماڵئاوایی لە یەک دەکەن..
بەبێت ژینم باوکی ژانە
وەک هەنگ وگوڵ،
یا خوێن و دڵ،
یا چاو و فرمێسکی بەکوڵ..!

خۆشم دەوێ ی،

خۆشەویستیت گێچەڵێکە و

لە دونیادا یەخەم

دەگرێت..!

خۆشم دەوێ ی،

خۆشەویستیت ،

دڵنیامە لەسەر ڕێگا

چەقۆیەکەو سەرم دەبرێت

خۆشم دەوێ ی

خۆشەویستیت،

وەکو هەر حەوت هەڵۆیەکەی

(قەڵاتووکان)[1]

خاتر جەمم بەرە و مەرگ باڵان دەگرێت...!

خۆشەویستیت

با زۆر تۆڕی دانراویش

لاقی بگرێت...

با زۆر ئەڕقەمی دوو پشکەش

لەسەر ڕێگا پەنجەی یەکپەرستی

ببڕێت...

---

(١) ئەو حەوت پێشمەرگەیە بوون، کە بەفەرماندەیی مامۆستا ( عەلی باپیر ) لە ٢٢/ ٧/ ١٩٨٨ لە هەڵمەتێکی پڵنگ ئاسایانەدا لە داستانی(گردی ڕەمکان ) ئەڵقەی گەمارۆی دوژمنی بەعسیان شکاند ناوەکانیان : ( مامۆستا عەلی باپیر، مامۆستا حەسەن بابەکر ئەحمەد ، مامۆستا علی خدر مەمکی، عبد الرحمن شێخ محمود لۆتەری، ئەحمەد حەمەد ئەمین سکتانی (ئەحمەد شاسوار) و ئومێد بۆسکێنی، مام ڕەسوڵ حاجی محمد).

**با زۆر نەمرووود و صەددامی عەرەب و کورد**
**نەواری تەمەنی بسڕێت..**
**دۆڵێک، گردێک، هەر دەڕەخسێت**
**وێنەی هەر چوار کۆتره مل بە خوێنەکەی**
**گردی (ڕەمکان)[1]**
**لە باوەشی گەرمی بگرێت...**
**گردی سەیوانێک هەر دەبێت،**
**وەکو هەرچوار خوشکە لەچک پەمەییەکان**
**وەکو چوار تۆقەی گوڵ بەدەم**
**لە سیمەن و قژیان بگرێت...**

**من لە پێش خۆم هۆنراوەکانم بۆ ناردی و،**
**چاك دەزانم**
**یەك بە یەکی وشەکانی لەت دەکرێت و،**
**لە تەوێڵی مەحەك دەدرێت...**
**ئەوسا ،**
**یا پێخەوی گڕە ،**
**یاخود بە شەهیدی دەمرێت...!**

*   *   *

---

(١) بریتین لە شەهیدان ( مامۆستا عبد الرحمن لۆتەری و ئەحمەد شاسوار و عومەر بۆسکێنی و تاهر مەمەنداوەیی) ، کە لە ٢٢/ ٧/ ١٩٨٨ لە شەڕی ( قەڵاتووکان ) داستانی ( گردی ڕەمکان) یان بە خوێنی گەشیان تۆمار کرد.

( )[1]

**هەر لەو ڕۆژەی ،**

**کە زانیم کارخانەی ڕاستی بەس ئاشتی یە..**

**هەر لەو ڕۆژەی ،**

**کە چیای بەفرینی ئاشتیم لێکدایەوەو،**

**لە زۆر قوپکی نەوی و بەرزا**

**ماندووی ڕێگام حەسایەوە...**

**ئەوسا زانیم:**

**بەرزترین دوندی ئاشتی**

**بەس ڕاستی یەو،**

**مۆخی ڕاستیش**

**تەنها یەکتا پەرستی یە...**

**هەر لەو ڕۆژەی ،**

**پێت گەیشتم**

**هەر هەمان ڕۆژ**

**دوای دانیشتن تێت گەیشتم..**

**کامتینی وشەی جوانی تۆی**

**بە ئەهوەنی**

---

(١) کۆساری لە دەستنوسەکانی دا هیچ ناوێکی بۆ دانەناوە و وەك خۆی بە بۆشایی هێشتویەتەوە.

هاتیه بنج و بنەوانم
چڵەپۆپەی تێگەیشتنی
پەیامەکەت پێگەیاندم..
تێت گەیاندم..
زانیم کە بەهەشت و دۆزەخ
دوانەی ژانی ژیانن
ڕێگاکان
تەنها دوانن ...
حەق و ناحەق ..
کاروانی دوو ڕێگایانن،
گڕەو شەماڵ..
چەتە و ڕێبوار..
خەنجەری پشتێنی کوێخاو
قولابی کەمەری حەمباڵ.. !

ئەی هەوێنی ئاوێنەی خۆشەویستیمان،
ئەی ڕاگری نساری ژیان،
ئەی یەکخەری ڕاڤەو ڕێسای دونیای قورئان،
ئەی دروستکەری چەک و پێشمەرگە و کوردستان،
هەر لەو ڕۆژەی ،
بە ڕاوەرێک
ڕاوەرێکی هێمن و مات
دڵ پڕ لە خۆشەویستیی باڵات
نامەی خۆشەویستیت دامێ
خۆشتم ویستی و،

هەر ئەو ڕۆژە
ڕۆژ لەناو دەروونی زیندووی ڕۆژئاوامدا
ڕۆژهەڵات و،
پاش ئەو ڕۆژە
ڕۆژ لە دوای ڕۆژ
شرکی پەرستانی خاك و،
سەنەمی مەزار و چاك و،
جاشەتی و نۆکەریی
دەستی کاکەو یابەم تەڵاق داوەو،
گوریسی باراشی دونیام فڕێ داوەو،
پشکۆی کۆلیجی یەکپەرستیم لەمشت ناوەو،
وەکو (عەممار) و وەك (صوهەیب)
بۆ گەیشتن بە ژوانی دیمی ڕووناکیت
کەس و کارو گیان و ماڵم
لەسەر تەختی لەپی قلیشاو داناوە..

هەر لەو ڕۆژەی
کە بینیمی و ،
سەرنجم دایە ڕێگاکەت
وشەکانت ،
تۆزی غوربەتیان پێوە بوو...
تك تك ڕاستی یان لێ دەتکا
منیش داماو...
تا ئێستا چەواشە کراو...
منی ڕەنجاو..

کوردی لە ڕێ هەتڵە کراو..
منی شارو لادێ برژاو
منی دەروون هەڵپڕوو کاو..
چوزانم تۆ ،
ئەتۆی ڕەوشت بڵیند و نامۆ،
بۆ برینی من..
بۆ ئێشی بێ حەجمینی من
سێبەری (چەمی ڕەزان) و ،
بۆ سڕینی ئەسرینی من
نەسیمی شەوی باسەری؟!
من واختکاو..
بۆ مستێک ئاو
من لەدوورەوە چوزانم
بۆ گەرووی من
پەرداخی حەوزی کەوسەری؟!
ئاوی دەماری زێوەرو
خوڕەی چۆمی (ئاوێسەر)ی؟!
من نەمزانی،
لێم ببورە...!
نەمزانی تۆ،
تۆی ڕێ پیشاندەرو ماخۆ...
بۆ تەریوان،
بۆ ئاوارەو ڕێ نەدیوان،
چراوگی دەستی پێشەنگ و
قەڵغانی سینگی ڕێبەری...!

کۆچی سووری (بەستە مەلە)[1] و
خوێنی شەهیدی (کونەڕا)ی..!
لوولەی هاوانی (کەلار)و
بڵیندگۆی بانی (ئەزهەر)ی..!

بازووی بیکەیسیی ( قوڵە هەرمێ)[2] و
سکاڵای لەیلەتولقەدری مزگەوتی (عەلی فەیصەڵ)[3] ی
مەرگی شەش هەزار منداڵی سەرایڤۆ و
زادو پۆشاکی نەدارانی
بیتوێن و مەرگە و پشدەری...!

هەر لەو ڕۆژەی ،
کە قورئانم کردە هاوڕێ..
ئاوێتەی خۆشەویستیی بووم
یەکمان ناسی و،
دوای خواناسین و خۆناسین و خاک ناسین،
لەبەرماڵ و کۆچ خارو ڕم و شمشێری گەیاندنم
ڕێگای ( دۆڵیشک ) و ( هەنجیرێ )[4] ی
پێ ناساندم
نەتان بیستووە ،

---

(١) شوێنێکە لەبناری قەندیل و چەند بنکەیەکی هێزی ئیمامی (حمزە) ی بزووتنەوەی لێ بوو, لەساڵی ١٩٨٧ و١٩٨٨.

(٢) گوندێکە لەپشتی شێنێی سەربە پشدەر و بنکەو بارەگاکانی هێزی حەمزە و شافیعی لێ بوون لە ساڵی ١٩٩٠.

(٣) مزگەوتێکە لەڕانیە.

(٤) چەند ڕێگایەکن لە پشتی ڕانیەو دەچنە کێوەڕەش,خەڵك و پێشمەرگە زۆر جاران لەوێوە بە قاچاغی هاتوچۆیان دەکرد بۆ پشدەر.

نەوبینیوە ،
چیای ڕەش پێستی کێوە ڕەش
هەڵبڕاوە..؟!
قەف بەقەفی
بێ کۆڵەکە ڕاوەستاوە..؟!
بە پێچەوانەی شۆڕشەکانی دونیا ،
یەکێکیان نا
داکوتراوە
وەکو دڵی سپیی (بیلال)
نوورانی یە وەکو ( ناصری سوبحانی)[1] و
ڕەنگی درەوشاوەی هیلال...
زۆر جار لە تافی لێقەومان
لە ڕۆژی ڕەش ،
ڕەشتر لەشەو،
ڕەش وەکو خواستی بەعس و (شا) و
نینۆکی پاشا ڤیکتۆریا و
وەک کوردستانی گیپەی گەدەی
دانیکۆرو فەڕوخ شا..
لە ڕۆژی ڕەش،
بەرەو داڵدەگای کێوە ڕەشی دەروون گەش
چەکی شانم،
سەری ئاشتیی ،
سەری سۆزو خۆشەویستیی
هەڵدەگرت و،

---

(١) لاوێکی یەکجار ڕۆشنبیری موسڵمانی کوردستانی سەر بە ئێران بوو و شەهیدیان کرد.

(موفرەدات) یش
وەکو شەماڵی سەر فیردەوس
تاوناتاو هەڵی دەکردو
شەقاو شەقاو،
میوەی شەهیدیی تێدەگرت
هۆ کێوە ڕەشی سەرکەش
دێتە بیرم
زۆر جارلە چنگی دڕی کوڕەکانی (میشێل عەفلەق)
لەناو بانگوێر و بەندەن و باخەڵتدا پاراستووم
زۆر جار وەکو (فەقێ حەسەن)[١] بەڕێگالەی (کونە سێ)و[٢]
(گەڵیاو)[٣]دا ڕۆشتووم
زۆر جار وەکو سینگی سەقرو
قاچی هەڵۆ،
لەسەر تاشە بەردو تاتت هەڵنیشتووم
زۆر جار وەکو پڵینگی ماندوو
لەناو خۆڵە پەتەی ئەشکەوت
تابەیانی لێی نووستووم
زۆر جار وەکو شێری تینوو
لەسەر چەقی ڕێی (سیروێیان)[٤]
بێباکانە پاڵ کەوتووم
زۆرجار وەکو

---

(١) لاوێکی زۆر چالاك و هەڵسوڕاوی ڕێکخستنەکانی بزووتنەوەی ئیسلامیی بوو، لەناو شاری ڕانیە لە کاتی ئەنجامدانی کارێکی گرنگی ڕێکخستن دا لە ساڵی١٩٨٩ لەلایەن نۆکەرانی بەعسی کافرەوە شەهید کرا.
(٢) ڕێگەیەکە لە پشتی ڕانیەوە بۆ کێوەڕەش دەچێ.
(٣) هەمان شت.
(٤) هەمان شت.

(ئەحمەد) و (عومەر) و (تاهیر)[1]
لەسەر لوتکە
بەشێوەی پێروو و تەرازوو
سایەقە گیانی بەستووم..!

هەر لەو ڕۆژەی
یەک ڕێی سپیم
لەناو سەت خەتی ڕەش ناسی
دوای ئەو ڕۆژە
تێگەیم لەبەرچی شالوور
ڕقی لە وروژمی بایە
بۆ مێرە قنجی کوێستانێ
حەزی لەعەتری خورمایە
بۆ پەروانەی باڵ کرووزاو تینوو شکانی،
تەنها بەگڕی چرایە..!

ئێستا گیانی خۆشەویستی و
لاشەی دونیا،
تەمەن کورتە
وەک سێبەری کێلە قەبر
وەک ڕووگەی گوڵە بە ڕۆژ
ڕووی لەگشت لایە
وەک خەرمانی بانی شەنە

(١) لە شەهیدانی قەڵاتووکانن.

هەڵپەڕینی بەزەوقی
تووزەڵەی بایە

هۆ ( مولازم موحسین)[1] ەکانی
بەعسی پێشووی لافاو بردوو،
هۆ کوڕە وەزیرەکانی
( نازم گوزار)[2] ی ئێستاو کاتی ڕابردوو،
ئێوە وا بێ بەزەیی یانە
چۆن دەتوانن
ئەو گوڵی (عەبدولڕەحمان) ە و
ئەو خونچە ئاڵی ( کەیوان) ە هەڵوەرێنن...؟!
چۆن دڵتان دێ،
وا بێ مروەت،
پێ بەسەر ڕوویان دابێنن..؟!
پاشان،
ئەم لاچک و قاچک و پەل و دڕکانە
بۆ بەرپێی کامە ڕێبوارە ئەویندارە،
دەهێڵنەوە..؟!

ئێستا لەناو (حامیە)ی دڵم
کەیوان ناوێک
باڵای بەقەد باڵای شەست پێشمەرگە جوانە و،

---

(١) مولازم موحسین یەکێك بوو، لە ئەفسەرە هارو دڕندەکانی ئیستخباراتی بەعسیان و لە خەڵکی شاری سلێمانی بەر بوو بوو.
(٢) مدیر ئەمنی عامەبوو ، لە سەرەتای حەفتاکان ، پیاوێکی یەکجار دڕندە و خوێن مژبوو ، لە شەڕی خۆبەخۆی بە عسیان دا کوژرا .

بەقەت نیگای شەست پێشمەرگە،
سیمای دەم و هەردوو چاوە گەشەکانی
هێلانەی ڕووحی ئیمانە..!
ئێستا (کاولۆکە)[1] دڵی منەو
ئاوەدانە..!
پڕە لە خوبەیب و خەبباب و سەعید و لە سەلمان و لە ئوسامە
ئێستا دەمی فەجری دووەو،
کاتی بانگی بەیانی یەو،
ئاوی دەستنوێژ،
شانازی دەکات بە ڕووخساری ئەم گەنجە دانستانە
ئێستا لەبەر چاوی داڵغەم،
لاوێکی بەژن باریکی کاکۆڵ زەردی نیگا سەوز
کەیوانێکەو لە پێش نوێژیی ڕاوەستاوە و
سەر قافڵەی هەر هەموویانە..!

* * *

(١) سەریە ڕەواندزە و دوای ڕاپەرین بارەگایەکی گەورەی بزوتنەوەی لێ بوو و مەشقیان تێدا دەکرد .

# پرسـه

من دانیشتبووم لەژێر کەپری خەمێکی ڕەش
خۆر: تەمی زەرد،
شاخ: بەفری بۆر،
کەنار: غەورێکی ڕەساسی ،
ئاسمان: هەورێکی خەنەیی،
ئاسۆ: ڕەنگێکی خوێناوی،
دارستان: سەوزێکی سپات،
ڕووبار: سەرپۆشی قەوزەی شین
خاکیش: پۆشاکی پێشمەرگە

هۆ بای خوارووو
تۆ لوورەو دەنگی گریانت بەو ئەندازە بۆ هەڵدەبڕی ؟!
بەم ناوەختە،
فسکە و پێکەنین و خوێندن،
لەم مەلە ئێسک سوکانە بۆ هەڵدەگری ..؟!
یا بە تەوری قینی ڕەشت
ئەم نەمامە نازدارانە بۆ سەردەبڕی..؟!
بەم ئێوارە کش و ماتە،
خۆر ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاوەو،
لوتکە تۆزی لێ ئالاوەو،
زەمین ڕەنگی بزڕکاوەو،
مژ زگی لە عەرزێ ناوەو،

شاعیر جووڵەی لێ بڕاوە
ئەو ناو ئاو و درەخت و دەشتە
ئەو پاناوکەو
ئەم سەیرانگایە بەهەشتە،
هیچ ئاوازێکم بۆ ناڵێ گریان نەبێ!
ئەم نوزە نوزەی زریانە،
هیچ هەواڵێکم ناداتێ ، مەیتی گەڵاڕێزان نەبێ !
بەم دیمەنە تراژیدیایە، لە خۆم غەریب، هیچ ئارامێکم بۆ نایە،
تەنویمی ڕوح کێشان نەبێ!
بارانی من، خۆڵ بارانە
بەهاری من مردنی گەڵا ڕێزانە..!
کوردستانی سپی و سەوز و سوور و شینم
نیشتیمانی کانگای گوڵاڵە و نەسرینم
ئێستا کۆڕی شین گێڕانە..!

دەی پێم بڵێن:-
هەتا فانۆسی دەروونم دوانەفەسی لێ نەبراوە،
تا گوڵە ئازارەکانی هەناوی من
لە ڕۆخ ئەم کانی یە فێنکە
چەپکە چەپکە
چاوی نەرمیان لێک نەناوە
دەی...
خۆ ڕۆژ هێشتا زەردەی سەر لێوە ئاڵەکەی
بە یەکجاریی نە گۆڕاوە
ڕووبار ڕووخساری پاراوە و

ئەم لێڕەوارە دڵپاکە،
ئەو ئاو و کەژە ڕووناکە،
هێشتا وەرەی بەرنەداوە...
دەدەی...
تا شاعیر خەیاڵی ڕەنگاو ڕەنگی شەپۆلاویی
وەک باڵی کەوانەی ڕەنگین
لەسەر ئەم باغە هەڵداوە..
هەتا خەو و پێڵوی دڵی، باوەشیان لەیەک نەداوە
تا کەژووی لغاوەی نوستن نەپچڕاوە...
زوکەن توخوا !
هۆ مەڵبەندی سیس هەڵگەڕاو،
هۆ باغاتی پرچ ژاکاو،
هۆ دەشتی بەراوی خنکاو،
بۆ بێدەنگن؟!
خۆ منیش وەک ئێوە غەریبەم
بە قەد قردێلەی بەرسیلەی ژێر پەرچەمی
ئەم دار مێوە ناسک و سەوزە
هەست ناسکم..!
ئێستا من میوانی درەنگ وەختی ئێوەم
ڕێگام دوورە،
تا دوور بڕۆم ڕەنگی غەریبیم تۆختره و
کۆڵی شانم قورسترە..
من میوانم
کوانێ میوە و مێوانی باغی میوەتان بۆ میوانان
خۆ دیارە ئێوەش میوانن

دیارە ئێوەش لە نیشانەی بەهێ ی زەرد و
ڕوومەتی هەناری سیس و
لالەنگی وشکبووی پەرتان
وەکو من غەریبەیەکی باغی فەرهەنگی ژیانن
وەکو من ئاهێکی گریاناوی
( کانی شێخە) و
شۆڕە بێ یەکانی ( دۆڵەبی) و
سۆی شینایی ( شێخ وەسان) ن...
وەکو من خەزانی دافەتاوی  دارستانی ( جەزائیر) و
باخچەی دەورە گراوی ( مصر) و
بنە داری نەلەقیوی چیای ( حەفتا و سێ) ی ( ئەفغان) ن
وەکو من باغی ( پێنج) بەشی ( سایکس بیکۆ) ی
دوێنێ و ئەمڕۆی کوردستانن!

بۆیە منیش لەو بەرزایی یەی لای خۆمەوە
چەند ساتێکە
سام و خامۆشی ی ئەم ناوە..
پۆپە شمینەی موچڕکی کشوماتی
دەمار دەمار بەسەرمدا هەڵکێشاوە..
دەمێکە وا
لەسەر ئەم تاتە نوێژینە
لەبن نیسێی ئەم ساباتە و،
ئەو کانی یە سپی و چاوشینە
دەستنوێژی ئێوارەم گرت و
سەرم چوار جار تەختی هەنیەی

ئەم تاتە پاکەی

ماچ کرد و،

سکاڵای لە (باری) ی بەرزی

پەروەردگاری ئێوە کرد

دەی توخواکەی

دەمێکە من وەکو گزنگ چاوەڕوانم!

وەکو زەردە لە جوانی ئێوە دەڕوانم..!

لە مێژە من لەم چۆڵایە،

لەم دۆڵە سەر ئاوەڵایە،

دانیشتووم بەبێ خشپە..

هەتاو ڕوومەتی لای ڕاستم دەدوێنێ

( با) یەخەی کراسی تۆزاوی سەر و ڕیشم

دەجووڵێنێ...

لە پێش چاوم...

وشە بە وشەی شیعرەکان لە ئاسمانی ئەم باغەدا

لە گەڵ پەلکی درەختەکان

گێژە ڵووکە لوولیان دەدا و بەحەوادا

دەیانفڕێنێ...

لەکەیەوە

لەم سەر تاتە،

لەو کانی ی ژێر ئەم ساباتە،

گوێم لەهەست و گریانی چرپەتان دەگرم...!

لەو تەمباسکەی لای خۆمەوە،

لە کەیەوە

لەسەر ئەم تاتە نوێژینە،
وەک خرخاڵێکی توورِ دراو لەو دەشتە پان و بەرینە
پشتم بەو کۆڵەکە داوە و،
ئامێزم لە هەردوو چۆکم وەرهێناوە و،
چاو لەنیگای فرمێسکاوی ئێوە دەبڕم..!
بە کامیرەی شیعرەکانم
یەک لەدوای یەک
ڕەسمی بالاّی خەفەتاویی ئێوە دەگرم !

دەی پێم بڵێن
هۆ دار سێوە چاو کاڵەکە،
هۆ هەنجیرە ڕەشتاڵەکە،
بۆ خامۆشن..؟!
بەم چەشنە بۆ مەندە هۆشن؟!
دە توخواکەی
هەر ئێستاکە
هەرچی ئۆف و کەسەرتانە
بەتاڵوکە
لە پێش منی هەڵبرێژن !
بەم ئێوارە کز و ماتە ،
بەم بولێڵە کش و ماتە
هاژەی ئەم چۆمە بۆ ئەگری ؟!
هۆ دار هەنار،
تۆ بۆچی وا دوور ڕوواوی و
بەتەقەوە،

هەروەکو من ،
دووره پەرێز ڕاوەستاوی و
پەل شکاو و گەڵا سڕی و
چاوم لێتە
بە گەڵای سەر قۆڵی ڕاستت
بە شەرمەوە
ئاونگی دوو چاوت دەسڕی؟!
هۆ پیره توو،
خۆ تۆ زۆر بەرز و تەرز بووی!
هێشتا زراف و سەوز بووی!
کەچی پشتت بۆ شکاوە و
کێ کەڵپەی لە قەدت داوە و
بەم گەردنە زەرد و جوان و گەڵا سەوزەت
بەری ئەم چۆمە بۆ ئەگری؟!
ئەدی ئێوە هۆ داربی یە پرچنەکان،
هەروەکو ئافرەتی شین گێڕ،
بە فیت و چنگی ڕەشەبا،
پەرچەم و زوڵفی خاوت بۆ ئەپچڕی..؟!
ئادەی بەسە !
ژیر بنەوە !
من وێرد و تەسبیح و نزای
ئەو کەناری و پاساریانەم زۆر لاخۆشە!
ئاهی ئەوانە دەتگرێ !
تۆ بۆ ڕێ ی خوێندنیان ئەگری؟!
لەم ناوچەیە بۆ کەس وەڵام ناداتەوە؟!

یاخوا لە کاکتان نەکەویٚ..!
ئەگینا من هەر هەمووتانم خۆش دەویٚ ،
بۆ زیرِووحێک سەرەبەنێک ،
لە گرفتی دەروونی من ناکاتەوە..؟!

دەبێت هیچ تەیرێکی دڵدار،
لە باغەکەیان کوژرابیٚ..؟!
دەبێت ئەمرِۆ،
هیچ پەپوولەیەکی جوان و خاڵدار
باڵەکانی وەک دڵی من
هەڵقرچابیٚ..؟!
دەبێت هیچ مێروولەیەکی ئازا و بەکار،
وەک دەنگی من
لە چۆمەکەیان خنکابیٚ..؟!

دوای چەند چرکەیەک بێدەنگی
لە پرِ راوچیەکی دەنگ گرِی ددان گرِی ماسی گر،
گوتی: ئەم شین و گریانە،
ئەو هاوار و لەخۆدانەی
ئەم چەم و گوڵ و دارانە،
بەرهەم و سەمەرەی پیٚریٚ ی پەرلەمانی
رووباری ناو دارستانە..!
گوتم: کامە؟
گوتی: لە ئینتیخاباتی پێشووی ناو ئەو چۆمە
لەناو ماسی یە سوورکە و پانکە و قورِاوی یەکان..

ناوی نوێنەران جاڕ دراو
هەڵبژاردن بەرپا کرا..
بەڵام هەی داخی گرانم!
بەدەستکیسی (ئەخطە بووطا) ی سەرو چاوەی ژێر ئەم پردە،
دیسانەوە،
قرش و نەهەنگ و مار ماسی
لەسەر خوێنی زەبوونەکان
کرانەوە بەسەرکردە..!
گوتم: ئێ... ئێ!
دەوا بڵێن!
یاسا یاساوڵی جەنگەڵە و
شێر ئەمڕۆ ڕێوی تەمبەڵە و
ئای بێ دادی
لەم دۆڵی جەنگەڵستانە!
بەلای ئێمە
هەتا ئێستاش
هەنگ و زەرگەتە وەک یەکن..!
چۆن دار بڕ و دار چەقێن
تەریبی یەکن؟!
بۆ دز و دەست بڕی دزان
هەردووکی خاوەنی چەکن ؟!
چۆن باغ سووتێن و باغەوان،
هەردووکیان خاوەنی حەقن..؟!

سبەینێ تولحی بەیانی،
بەر لەوەی جێتان بهێڵم بە یەکجاری...
بە ڕا کردن
توند توند باوەش
لە قەد و لقی زەرد گەڵای هەر هەمووتان
وەر دەهێنم...
تێر تێر دەستی تەڕو برم
بەکەزی و پەلکی سووتاوی هەر هەمووتان
دادەهێنم...
هەر ئەو کاتە
چەند مستێک ئاو
بەدم و چاوی هەڵاو بردووی
ئەم ڕیحانە و گوڵانەدا دەپڕ ژێنم..
ئەمجار دەسکێک خەم و مەڵۆیەک ئێش
لە ئێوە و لە گەڵ خۆم دا بۆ شارە بێ مرادەکەی خۆم دێنمەوە..
کە چوومەوە..
ناڵە و مەینەتی داستانی
ئەم دارستانە غەریبە
بۆ برایانی ڕەش و ڕووتی (مەڵبەندی سێ)[1] دەگێڕمەوە..!

*   *   *

(١) مەڵبەندی (٣) ی ڕانیەی بزووتنەوەی ئیسلامی پێشوو.

# بیستی دوانزە بوو [١]

بیستی دوانزە بوو ،
دووشەممە بوو ،
شەهیدێکم بینی
بەردێکی سووری لە ژێر سەری دانابوو...
کاغەزێکی لە گیرفاندا بوو...
دەرم هێناو کردمەوە ،
لێ ی نووسرابوو ،
هەر کاتێک بینیتان
دار گوێزێک موتوربەی دار خورما بێت
ئەوسا دەشێت
ئاڵای غەیری ئیسلام
لە کوردستان ڕەگ داکوتێت .

*    *    *

---

(١) ئەم شیعرە بێ ناوو نیشان بوو , ئێمە بە پێی دێڕی یەکەم ناوەکەمان بۆ داناوە. بە بۆنەی شەهید بوونی (هیوا شێوەرەزی) نووسراوە کە لە ١٩٩٣/١٢/١٨ لە کفری نەخافڵ شەهیدکرا و چەند پێشمەرگەیەکی هاوڕێشی زامداربوون ، کۆساری ئەم شیعرەی لە ڕێپێوانەکەی ١٩٩٣/١٢/٢٠ لە ڕانیە خوێندۆتەوە .

# گەر حەزتـان کرد [1]

گەر حەزتان کرد لە ناوکاری شیعرەکانی من بپرسن
بڕۆن سەیری
بورجەکەی باڵای (مصعب) و
باڵای بورجەکەی (کەلار) و
قەڵاتەکەی (چەمچەماڵ) کەن
گەر دەپرسن لە عیشقی هۆنراوەکانم
بڕۆن لەو مۆمانە پرسن
کە لەجەژنی لە دایک بوونی شعرێکم
لە ئێوارێ هەتا بەیان ئێشک دەگرن
بەرامبەر من دەگریێن و
وەکو شیعر دەسووتێن ...

*        *        *

---

١- ئەم شیعرە بێ ناوو نیشان بوو ، ئێمە بە پێی دێری یەکەم ناوەکەمان بۆ داناوەو لە دەستنووسەکانیش دا ئەم شیعرە نەبوو. لە بەر کاسێت نووسیومانەتەوە.

# دەزانن بۆ [1]

دەزانن بۆ ،
ئێستا لەناو دڕندە یەکنە گرتووەکان
سەری زمانت
هەر بیبڕێ
کاف، واو، ڕاء، دال
لەسەر شاشەی بیرەوەری یان
میلی قەنناسەی بێچوە ئەیوبیەک
تریشقەی دێ و
سەر گەورانی ناوک ڕەشی
کۆشکی سپی،
بە دەردی سەر کاری فەڕەنسا و
فەرماندەی بەریتانیای
ساڵی (١٩٠ چووە..؟!

* * *

---

(١) ئەم شیعرەش لە دەستنووسەکاندا هیچ ناو و نیشانێکی بۆ دانەنرابوو، و ئێمە بە پێ ی دێڕی یەکەم بۆمان داناوە.

# چـــواریـــــن

لـه دونیـادا لـه دایـک بـوون دوو بــوونــــــه
یـەک لـه داوێـن ئـەوی دی بـۆ گـۆڕ چـووەنـه
ئـاخـوڕ و ڕەحـلـه تـەریبـن بـۆ ئـەو کـەســەی
مـەرگ بـەلایـەوە فـەوت و تێـدا چــوونــــــه
* * *
وەک کـۆمـەڵـەی خـۆرێ لـه ســووڕانــه زەینـم
دابـەش و کـۆی دوو ژیـانـه ســەیـن و بـەینـم
لێــواری عــەرزێ ڕاســتـره لــــه مێشـــکـی وەی
مانگ له سـوێی بێ و بڵـێ بـەس شـەوێ دەبینم
* * *
لـه میـانـی گێتـی ، بـوونـی مـرۆڤ ئـەزمــوونــه
کـه یـادی ژیـن مـەرگـه و مـردنیش ڕابـوونـــه
گەر یەک له گەردوونی بێ گەرد گەردن که چ بێ
بیرکـاری جیهـان تـەنهـا بـەرەو خــوا چــوونــه

* * *

## زانست

زانیاری یە هەست و هۆشم
بەرگی زانستی دەپۆشم
بۆ نەتەوە بە پەرۆشم
ئەرکە لەسەرم تێکۆشم

خوێندن داری سەربەستی یە
نە زانین نەنگی و سستی یە
زانست بەرزە و ڕێ ی ڕاستی یە
زانین خودا پەرستی یە

خاوەن بیرم پاکە دڵم
بۆ ئەو ڕێبازە بە کوڵم
گەر ئەو دارە ئەمن ( چڵ) م
گەر گوڵە منیش بولبولم

*   *   *

# فەرهەنگیلە

( أ )

**ئاران**: گەرمێن و گەرمە سێر.

**ئاویلکە**: سەرە مەرگ، ئاوزینگی مردن.

**ئۆخژن**: ئۆقرە، ئارام.

**ئێروو**: کەسێک پێداویستی یەکانی ژیانی مسۆگەر کرابن.

( ب )

**باری ( باری ع )**: وە دیهێنەر و درووستکەر، مەبەست خوای گەورەیە.

**بانگووش**: بانگێڕ،باگردێن.

**بڕست**: تین و توانا.

**بریم ناشکێ**: تامەزرۆییم ناشکێنێ، دڵم داناکەوێت.

**بزوو ؛ بووزوو**: شاڵ، قوماشی لە مەرەز درووستکراو کە ڕانکو چۆخەی لێ ساز دەکرێت.

**بەستێن**: کەناری چەوە لێنی چۆم و ڕووباران.

**بە عومری خۆی**: لە ژیاندا، هەرگیز.

**بێ هەڵدا**: بێ مشت و مڕ، بێ ئەولاو ئەولا.

( پ )

**پەڵوختە** :مەشعەل

**پاتە**: پێڵاو، کەوش، سۆڵ.

**پەڕکوڕ**: بێچوە هەڵۆ.

**پێڕ**: تاقم،جەماعەت،دەستە.

**پێڕوو و تەرازوو**: دوو کۆمەڵەئەستێرەن.

**پیواری**: ون و نادیار و غەیبی.

( ت )

**تالّووکه**: پەلە، عەجەلە.
**تخێڵ**: سلار، کەوتووی گرێ لێ براو.
**تەوس و تەشەر**: تیر و توانج، پلار.
**تەریوان**: ئاوارە و دەربەدەران.

( ج )

**جواناو**: ئەو ئارەقەی دەموچاوی مردوو لەسەرە مەرگدا دەری دەکات.
**جەب نەدەر**: قان نەدەر، دەرباز نەکەر، قوتار نەکەر.

( چ )

**چۆوە**: سپات بۆوە، سپی بۆوە.

( ح )

**حەجمین**: هەدادان، ئارام گرتن، داسەکنان

( خ )

**ختم**: قم، نوقوم.
**خەمگروو**: قۆری (گیانداریکی وەک سەرمازمڵەیە).
**خودکار**: قەڵەم جاف.

( د )

**درێشووکە**: زمانی مار و چزووی جرو جانەوەر.
**دەرۆستی نایێ**: دەرەقەتی نایەت، پێی ناوێرێت.
**دەناخننە دڵان**: دەدڵانی داوێن، دەیخەنە نێو دڵان.
**دەشقەڵمینە**: بەشکو، بەڵکو.

( ر )

**ڕادەقەنا**: بەردەبۆوە، دەکەوت.
**ڕادەمووسێ**: بە قووڵی ماچی دەکات.
**ڕەستا خیز**: قیامەت و زیندوو بوونەوە.

( ز )

**زگار**: وەڕەز و بێزار.

**زەمەند:** چخورد، گژوگیای هەڵچووی سەر لێکدراو.

**زەندەق چوو:** زراو چوو، نەترە چوو،تۆقیو.

(س)

**سەرکۆت:** سەر ڕووت.

(ش)

**شالوور:** بولبول.

**شەقاو:** هەنگاو.

(غ)

**غەنیم:** ناحەز و نەیار، دوژمن.

**غەوارە:** پەریوە، ئاوارە، بێگانە .

(ف)

**فڕووزایی:** یەک تۆز.

**فەهێت** : شەرم.

(ق)

**قەشکێن:** قەند شکێن، شەکر شکێن.

**قولاغ:** وریا و لەسەر هەست، وشت .

(ک)

**کەسەر دار:** حەسرەت دار، خەفەتبار.

**کرمە ڕێز:** کرمێ.

**کەوت:** دارێکی جوان و قایمی بێ بەرە.

(گ)

**گەوە:** لابەلا.

**گورگە مێش:** بەو سەگە دەڵێن کە لە جیاتی پاسکردنی مێگەل،بۆ خۆی مەڕ و ماڵات دەختکێنێ و دەیخوات.

**گرچوو:** کەلەکە، لاقەد.

**گفت:** بەڵێن و پەیمان.

**گۆڕین:** ناوبراو، تاین.

**گۆشته زوون**: ئەو گۆشتەی لە حەد و سەری چابوونەوەدا برین دادەپۆشێت.

**گوڵ بەدەم**: سەر بە کوڵووکە.

(ل)

**لاکەنەوە**: ئاور بدەنەوە.

**لە هێکڕا**: لە ناکاو ، لە پڕ.

**لێك لێك**: لێکدا لێکدا، پەیتا پەیتا.

**لێو عەیان بێت**: لێتان ئاشکرا بێت ، بیزانن.

(م)

**مەدار دەکەن**: ئیدارە دەکەن دەژین، دەحەوێنەوە، گوزەران دەکەن، هەڵدەکەن.

**مژ**: تەم.

**ماخۆ**: خاوەن ، خێو.

(ن)

**نامگنخێنێ**: دوام ناخات، ساردم ناکاتەوە.

**نەخاپاو**: هەڵنەخەڵەتاو.

**نەوینیوە**: نەتان بینیوە.

**نیسێ**: سێبەر.

(و)

**ویقار**: ڕێز و سەنگینی و شکۆ.

**پاتە**: پاسەوانی زیندان.

**وشت**: وریا.

**وڵسات**: ئاژەڵ و ماڵات.

(ه)

**هەدەر**: خۆڕایی،بێ سوود.

**هەڵگوڕمان**: کوشم هەڵاتن، خۆ ڕێکهێنان لە سەرمان یان لە خەفەتان.

(قەڵەمی ڕاستگۆ)

[illegible]

چەند خونکارێکی ڕەنگاو ڕەنگ
خڕ بوونەوە لە پەرداخێک
بەستێوەو ڕەنگ
سەرزارەکی بۆ کردارێک
بوون بە پەڵە ڕەنگ
بەڵام پێنووسێکی خۆشنووسی سپی نووس
ئەناباو حەڵەزەلی
بەو تینەی حەمرینی
بوو بە قەندیل
ئەڵێ هەر قەندیلی بە سەندیل
بوو بە سوورێن
بوو بە کێوی ئاسنگەران
بوو بە لووتکەی سەختی شنوور
بوو بە سنوور بە سنووری کاڵاو بەرگی سوور

بپرسن لەو خامە پڕو خامو خاوەن خام و قامەی
پێیەو تێیە بە خەڵکی سوورێ بە
پاسپۆرتی
کەم ئاسمانی لە چاو ون و

٤٠

کام ئۆقیانوسی بێ بنە و
کام دەربەندی هەزار و یانزە مانگی سوون و
کامە ڕێگەو سێ مە جێگەو
کامە دووڕگە
سێ سەد و شەست بتەو ڕووگەو
کام ئاوایی یە ڕەش ڕەنگە و
کامە دێهاتە لاپەڕگەی لە هەگبێ یە

بۆیە دەڵێ
لەســەرەخۆ بە ڕاشکاوی
لەوەڕزمەدا
دەڵێ بەڵێ
ئەمن قەڵەمی قامکی لێ بەڕوێکم
دار بەڕوێکی زۆر بەقەمەرت
تا بڵێی گەنج
تاکە بەڕوو
بەرز تاقە سەڵەمەسێو
خەزانی دەری و
بەڕوێکی لاخ و گەڵا کڕوزاو و پەل شکێتراو و

هەر ئەو ڕۆژەی
بێتە گەیشتن
هەر هەمان ڕۆژ
دوای دانیشتن تێک گەیشتن
کامێتێک دوو شەی جوانی تۆی
بەنەهوونی
ماتێ بێنج و بنەوان
چلە بۆبەی تێگەیشتنی
بەپامەکەت بیگەیاندم
تێت گەیاندم
ژانی سەبەهەشت و دۆزەخ
دوانەی ژانی ژیانت

ح

(ڕەنگی نادیار) (٣)

دەنگێ دێتە گوێم
دەنگێ دەبینم
ئاچۆن دەنگێ
دەنگی بێ ڕەنگ
چەشنی گیزەی ڕەوتی هەنگێ
دەنگێ دەبینم
دەنگی بێ دەنگ
لە شێوەی شەوە زەنگێ
وەکو مەستی باڵی شتمار
شێوەی پشووی سۆزی شمشاڵ
ووشەی شینە
گەڵای گەنم
سرپەی ~~[illegible]~~ داروو چرکە چرکی دڵی زنە
ڕەنووی بەفر
شڵپەی کانێ
فرمێسکی شادی ئاوچاوی شووشە عەتر

لە کۆتایی پاشکۆی شەوگار دەنگێ دەبینم
دەنگێکی ئەفسووناوی نەرم —
~~[illegible] نادیم~~
پێوەی تاقەکەسێ بدیم





کۆساری ( ١٩٧٣ ) ڕانیە





کۆساری ( ١٩٧٧/٦/٦ ) ڕانیە



کۆساری لەگەڵ مام محملی باوکیدا(مانگی ٢/١٩٨٦/ )



کۆساری لەگەڵ (تەها بابان دا)



کۆساری لەگەڵ پیرە مێرێکدا دوای ئەوەی لەشەقام بەرئەدوویەتەوە ئەم وێنەیەشی لەگەڵدا گرتووە/رانیە



کۆساری (١٩٨٥/٥/٢)رانیە

# ناوەڕۆك

